# دروستكردنی داتابەیس




Step by Step




Build exactly the skills you need.
Learn at the pace you want.

ئامادەكردنی محمد فایەق كاكە

زانستی كۆمپیوتەر - زانكۆی گەرمیان

# پێرست


سەرەتا ................................ ٢
داتابەیس ............................ ٣
پێکهاتەی داتابەیس......... ٣
تەیبڵ ................................. ٤
Design View .................... ١٦
چوونەسەر Design View............. ١٧
Data Type ...................... ١٨
Primary Key ................. ٢٨
Default Value ............. ٣٠
Decimal Places ............ ٣٠
Field Size ...................... ٣١
Input Mask ................. ٣٢
Format ........................ ٣٣
Validation Rule .......... ٣٤
Indexed ........................ ٣٧
Query ........................... ٣٩
Required ........................... ٦٨
Relation Ship .................... ٧٠
Form .................................. ٨٤
Form Design ...................... ٩٤
Search Engine .................. ١٢٤
پێکەوەبەستنی فۆرم................. ١٣٠
داخستنی فۆرم ........................ ١٣٨
گەورەکردنی فۆرم .................. ١٤٠
Report ................................ ١٥٢
Compact & Repaire ........ ١٦٢
Protected Database ......... ١٦٥

# پێشەکی

بەناوی خودای گەورە و دلۆڤان پشت بەخوای گەورە لەم کتێبە بچووکەدا باسی درووستکردنی داتابەیس دەکەین بە بەرنامەی Access ٢٠١٦ کەکۆتا وەشانی کۆمپانیای مایکرۆسۆفتە بەڵام پێش باسکردنی چۆنیەتی درووستکردنی داتابەیسەکە باسی کۆمەڵێ کرداری گرنگ دەکەین کەپێویستە باسبکرێت پێش درووستکردنی داتابەیسەکە .

# سەرەتا

سەرەتائەم کردارانە ئەنجام دەدەین بۆ درووست کردنی فایلی داتابەیسەکەیان کردنەوەی بەرنامەکە .




دواتر ناوی داتابەیسەکە و شوێنەکەی دیاری دەکەین




دواتر گرتە لەسەر Creat دەکەین داتابەیسەکە درووست دەبێت .

# داتابەیس

داتابەیس واتە ئەو شوێنەی کەئێمەدەتوانین زانیاریەکانمان تێیدا هەڵبگرین و بیانپارێزین ،داتابەیس بەشێوەیەکی گشتی کار لەگەڵ زمانی SQL دەکات یان ئەو بەرنامانەی کەئەم زمانە بەکاردێنێت .

(Access , SQL Server, My SQL ,PL /SQL)

# پێکهاتەی داتابەیس

بەشێوەیەکی گشتی داتابەیس لە Access دا لەسێ پێکهاتەی سەرەکی پێکدێت :

١- Table

٢- Form

٣- Query

لەپەڕەکانی دواتردا باسی هەموویان دەکەین

# Table

**تەیبڵ پێکهاتەیەکی سەرەکی درووستکردنی داتابەیسە هەمیشە بۆ درووستکردنی داتا بەیس پێویستە تەیبڵ بە کاربێنین .**

**تەیبڵ پێکدێت لە** Field (column) **و** Record(Row)

Row **واتە ڕیز و** Column **واتە ستوون**

## **درووستکردنی** Table

**بۆ درووستکردنی تەیبڵ سێ ڕێگای سەرەکیمان هەیە :**

**١-سەرەتا کاتێك گرتەمان کرد لەسەر** Creat **کاتێك داتابەیسەکە درووست دەبێت ڕاستەوخۆ بەشێوەیەکی خودکاری تەیبڵێك درووست دەبێت لەسەرشێوەی** Data sheet view.

**٢-کاتێك داتابەیسەکە درووست دەکەین دەچینە سەرئایکۆنی** Creat **لەسەرەوە دواتر کلیك لەسەر** Table **دەکەین و تەیبڵێك درووست دەبێت لەسەرشێوەی**Data sheet view.

## نموونەیەك لەسەر تەیبڵ

ستوون

ڕیز

Table1

| ID | ناو | تەمەن | مووچە |
|---|---|---|---|
| 1 | محمد | ١٩ | $10,000.00 |
| 2 | ئاسۆ | ٢٣ | $677.00 |
| 3 | كاروان | ٣٣ | $888.00 |
| (New) | | | $0.00 |

## ٣-درووستكردنی تەیبڵ لەباری Design View.




ناوی فیلّد

Data type

Table1

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | AutoNumber |
| ناو | Short Text |
| تەمەن | Short Text |
| مووچە | Currency |

دواتر كليك لەسەر View دەكەین بۆ چوونە باری Data sheet view

# دەستکاری کردنی تەیبڵ

ئێمە دەتوانین دەستکاری ئەو تەیبڵەبکەین کەهەمانە بە ئارەزووی خۆمان کەبمانەوێ چۆن پیشان بدرێت .

دیاری کردنی ڕەنگی هەموو فۆرمەکە

شێوازی دەرکەوتنی هێڵەکانی تەیبڵەکە

دیاریکردنی ڕەنگی نووسینەکە

کەئایکۆنەکەمان ڕاگرت لەسەری هێمای+ پیشاندا دەتوانین ستونەکە گەورە و بچووک بکەین بۆلای ڕاست و چەپ

# چەند کردارێکی دیکە لەسەر تەیبڵ

| | |
|---|---|
| 2 | هاوڕێ |
| 3 | ئاکار |
| 4 | کەمال |
| 5 | هەستی |
| (New) | |

بۆ زیادکردنی بەرزی ڕیزەکان بەکاردێ سەرەتا کلیکی ڕاست لەسەر شوێنەکە دەکەین و Row Height هەڵدەبژێرین دوتر نرخی بەرزیەکە دیاری دەکەین




لەبەشی Home دا ئەم سێ ئایکۆنەمان هەیە کە ئاراستەی نوسینەکە دیاری دەکات بۆلای ڕاست و بۆلای چەپ و ناوەڕاست

بەكاردێ بۆ دۆزینەوە كاتێك كلیكی لەسەر دەكەین لە Find
What ناوی ئەوشتە دەنووسین كەدەمانەوێ بەدوایدا بگەڕێن




بەكاردێ بۆ دیاری كردنی یەك ڕیز
یان هەموو تەیبڵەكە

بەكاردێ بۆ گۆڕینی وشەیەك بۆ وشەیەكی تر لە Find what ناوی وشەكە دەنووسین دەمانەوێ بیگۆڕین لە Replace with ناوی ئەو وشە دەنووسن كەدمانەوێ بیگۆڕین بۆی دواتر Replace دەكەین.



# زیادکردن و کەمکردنی ڕیز

ئەو تەیبڵەی کە هەمانە ئێمە دەتوانین ڕیزەکانی ئەو تەیبڵە زیاد و کەم بکەین .

## زیادکردنی ڕیز

Table1

| ID | ناو | تەمەن |
|---|---|---|
| 1 | چۆمان | 19 |
| 2 | هاوڕێ | 28 |
| 3 | ئاکار | 20 |
| 4 | کەژال | 26 |
| 5 | هەستی | 8 |
| (New) | | 0 |

کلیکی ڕاستی لەسەر دەکەین دواتر New Record هەڵدەبژێرین.

## کەمکردنی ڕیز

Table1

| ID | ناو | تەمەن |
|---|---|---|
| 1 | چۆمان | 19 |
| 2 | هاوڕێ | 28 |
| 3 | ئاکار | 20 |
| 4 | کەژال | 26 |
| 5 | هەستی | 8 |
| (New) | | 0 |

کلیکی ڕاستی لەسەر دەکەین و Delete Record هەڵدەبژێرین.

# ڕیزکردن و فلتەرکردن

لەناو هەموو تەیبڵێك دا دەتوانین کرداری ڕیزکردن و فلتەرکردن ئەنجام بدەین .

## ڕیزکردن

لەکرداری ڕیزکردن دا سەرەتا ئەو ستوونە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ کرداری ڕیزکردنی بەسەربێنین, ڕیزکرنەکە لە Z بۆ A یان A بۆ Z دەبێت .




سەرەتا ستوونەکە دیاری دەکەین

# فلتەركردن

فلتەر كردن بەكاردێت بۆ ئەوەی بمانەوێ ناوێك یان هەرشتێكی دیكە لەناو تەیبڵەكەمان دا نەبێت بەڵام سەرەتا ستوونەكە دیاری دەكەین كە دەمانەوێ فلتەری بكەین .




دوای كلیك كردن لەسەر فلتەر هەموو داتای ناو ستوونەكەمان پیشان دەدرێت، هێمای راست لەسەر ئەو داتایە لادەبەین كە دەمانەوێ فلتەری بكەین .

# کۆپی کردنی تەیبڵ




دواتر کەمێك ئایکۆنەکە کەمێك دێنینە خوارەوە و Paste دەکەین و ناوی دەنێین .

# سڕینەوەی تەیبڵ

سەرەتا ئەگەر تەیبڵەکەمان کراوە بوو دەبێت تەیبڵەکە دابخەین وەکو نموونەی خوارەوە .






# بڕین و کۆپی کردنی ستوون له تەیبڵ دا

دەتوانین کرداری بڕین و کۆپی کردن لەناو تەیبڵ دا ئەنجام بدەین .

## بڕینی ستوون

بۆئەنجام دانی کرداری بڕین سەرەتا ستوونەکە دیاری دەکەین دواتر دەڕۆینە سەر Cut دواتر ئەو شوێنە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ ستونە بڕاوەکەی لێ دابنێین دواتر  Paste دەکەین.




دواتر ئەو شوێنە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ ستوونە بڕاوەکەی لێ دابنێین دواتر Paste دەکەین.

# كـۆپـی کـردنـی سـتـوون

بۆ ئەنجام دانی کرداری کۆپی کردن سەرەتا ئەو ستوونە دیاری دەکەین کە دەمانەوێ کۆپی بکەین دواتر کلیك لەسەر Copy دەکەین دواتر ئەو شوێنە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ لێی دابنێین دواتر Paste دەکەین.




دواتر دەڕۆینە سەر ستونێکی دیکە کلیك لای ڕاست دەکەین دواتر Inset Field دواتر لەسەر هەمان ستون Past دەکەین.

# کۆمەڵێ کرداری گرنگ

١-Field Width بەکاردێ بۆ زیاد کردنی پانی ستوون کاتی ستونەکە دیاری دەکەین دواتر کلیکی ڕاست دەکەین.

٢-Hide Field بەکاردێ بۆ شاردنەوەی ستوونێك سەرتا ستوونەکە دیاری دەکەین دواتر کلیکی ڕاست دەکەبن Hide Field هەڵدەبژێرین.

٣ -Unhide Field بەکاردێ بۆ پیشاندانی ئەو ستوونانەی کە شاردراوەتەوە سەرەتا هەموو تەیبڵەکە دیاری دەکەین دواتر کلیکی ڕاست دەکەین و Unhide Field هەڵدەبژێرین دواتر هەموو ستوونەکان پیشان دەدرێت هێمای ڕاست لەو چوار گۆشەیە دەکەین کە هێمای ڕاستی لێنەدراوە .

٤-Freeze Field بەکاردێ بۆ ئەو ستوونانەی ئەگە بمانەوێ ئیتر داتا داخلی ئەو ستوونە نەکەین سەرەتا ستوونەکە دیاری دەکەین دواتر کلیکی لای ڕاست دەکەین دواتر Freeze Field دەکەین ئەگەر بمانەوێ ئەم کردارە لابدەین Unfreeze All Field هەڵدەبژێرین.

٥-Rename Field بەکاردێ بۆ  ناونانی ستوونەکە .

# Design View

بەشێکی هەرەگرنگی بەرنامەی Access کەدەتوانین تەیبڵی تێدا درووست بکەین ، درووست کردنی تەیبڵ لەم بەشەدا باشترە چونکە دەتوانین بەئارەزووی خۆمان ناوی ستوون بگۆڕین یان جۆری Data type بگۆڕین .

## بەشـەکانی Design View

Design View لەسێ بەشی سەرەکی پێکدێت لەخوارەوە دەیان ژمێرین وە باسیان دەکەین :

١- Field Name/لە ستوونی Field Name ناوی ستوونەکەمان دەنێین.

٢-Data type جـۆری داتا دیاری دەکـەین بۆ نمـوونە ئـەگـەر سـتـوونـەکـەمان ناوی تـەمـەن بێت دەبێت Number هـەڵبژێرین ،ئـەگـەر هـەر داتایەکـی دیکـە هـەڵبژێرین هـەڵە دەبێت بۆ نمـوونە text .

٣- Description بەکاردێ بۆ نووسینی کۆمێنت کەتەنها خۆمان دەیبینین .

# چوونە سەر باری Design View

به چەندین ڕێگە دەچینە سەر باری Design View:

١-

گرتە لەسەر




2-




٣-کلیکی ڕاست لەسەر تەیبڵەکەمان دەکەین Design View هەڵدەبژێرین .



# جـۆری زانـیـاری Data type

| Data type | وەسـفـکـردنـی جـۆری زانـیـاری |
|---|---|
| Short Text | بۆ نووسـینـی پیـت و ژمـارەش وەردەگـریٚ تاوەکـو ۲۵۵ دەتوانیـن بنـووسـین |
| Long Text | بۆ نووسـینـی پیـت و ژمـارەش وەردەگـریٚت تاوەکـە ٦٥.٥٣٥ دەتوانیـن بنـووسـین |
| Number | بۆ نووسـینـی ژمـارە بـەکـاردیٚ |
| Data/Time | بۆ نووسـینـی بـەروار و کـات بـەکـاردیٚ |
| Currency | بۆ نووسـینـی بڕی دراو بـەکـاردیٚ بـە ژمـارە |
| AutoNumber | بۆ نووسـینـی ژمـارە بـەکـاردیٚ بـەشـیٚوەی یـەك لـەدوای یـەك |
| Yes / No | بۆ نووسـینـی بـەڵـیٚ یان نـەخـیٚر و بـەشـیٚوەی چـوارگـۆشـە |
| OLE Object | بۆ دانـانـی ویٚنـە یان فـایل بـەکـاردیٚ تاوەکـو ۷۰۰ KB |
| Hyperlink | بۆ دانـانـی لـینـکـی ماڵـپـەڕ بـەکـاردیٚ |
| | |
| Calculated | بۆ ئـەنـجـامدانـی کـردارە بیرکـارییـەکـان |
| Lookup Wizard | بۆ درووسـتـکـردنـی کـۆمـبـۆ بـۆکـس |

بۆئـەوەی ئـەم داتاتایپانـە بـەکـاربیٚنیـن بۆ خـشـتـەکـەمان دەبیٚت سـەرەتا خـشـتـەکـە ببـەینـە باری Design View

# Short Text

جۆرێکی داتایە کە ئێمە دەتوانین بۆ نوسینی کورت بەکاریبهێنین کەدەتوانین تاوەکو ٢٥٥ پیت بنووسین وە ژمارەش وەردەگرێ .

Table1

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | AutoNumber |
| ناو | Short Text |
| تەمەن | Number |
| بەرواری لەدایکبوون | Date/Time |
| ڕەگەز | Short Text |
| شار | Short Text |

# Long Text

جۆرێکی داتایە کە ئێمە دەتوانین بۆ نوسینی کورت بەکاریبهێنین کەدەتوانین تاوەکو ٦٥،٥٣٥ پیت بنووسین وە ژمارەش وەردەگرێ .

Table1

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | AutoNumber |
| ناو | Long Text |
| تەمەن | Number |
| بەرواری لەدایکبوون | Date/Time |
| ڕەگەز | Short Text |
| شار | Short Text |

# Number

جۆرێکی داتایە کەدەتوانین ژمارە بەکاربێنین، بۆ نموونە لەگەڵ تەمەن دا دەتوانین ژمارە بەکاربێنین .

Table1

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | AutoNumber |
| ناو | Long Text |
| تەمەن | Number |
| بەرواری لەدایکبوون | Date/Time |
| ڕەگەز | Short Text |
| شار | Short Text |

# AutoNumber

جۆرێکی دیکەی داتایە کە زۆر گرنگە کە دەتوانی ژمارە بەکاربێنین بە شێوەی ئۆتۆماتیتکی یەك لەدوای یەك بەبێ دووبارە بوونەوەی ژمارە دەتوانین ئەم جۆرە داتایە لەگەڵ ID بەکاربێنین لەهەر تەیبلێکدا یەك فیلْد دەتوانێ بەکاربیبێنێت .

Table1

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | AutoNumber |
| ناو | Short Text |
| تەمەن | Number |
| بەرواری لەدایکبوون | Date/Time |
| ڕەگەز | Short Text |
| شار | Short Text |

# Yes / No

**جۆرێکی داتایە کەدەتوانین بەکاری بێنین بە بەڵێ یان نەخێر کە بەشێوەی چوارگۆشەیەك دەردەکەوێ کەهێمای ڕاستی لێبدەین یان نا .**

Table1

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | AutoNumber |
| ناو | Long Text |
| تەمەن | Number |
| بەرواری لەدایکبوون | Date/Time |
| ڕای تۆ | Yes/No |

Data sheet View لەباری

Table1

| ID | ناو | تەمەن | بەرواری لەدایکبوون | ڕای تۆ | Click to Add |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | چۆمان | 19 | 27-Jul-17 | ☑ | |
| 2 | هاوڕێ | 28 | 15-Apr-17 | ☐ | |
| 3 | ئاکار | 20 | 11-Apr-17 | ☑ | |
| 4 | کەژاڵ | 26 | 16-Apr-17 | ☐ | |
| 5 | هەستی | 8 | 29-Apr-17 | ☑ | |
| (New) | | 0 | | ☐ | |

# OLE Object

**جۆرێکی داتایە کەلەڕێگەیەوە دەتوانین وینە یان فایل داخلی داتابەیسەکەمان بکەین بەڵام نابێ KB ٧٠٠ زیاتر بێ ، بە دوو ڕێگە ئەم کارە دەکەین .**

## ڕێگەی یەکەم

**دەتوانین ئەو وێنەیە یان ئەو فایلەیە کلیکی ڕاستی لەسەر دەکەین Copy دەکەین دەڕۆین لە خانەیەی کەخۆمان دەمانەوێ paste دەکەین .**




| ID | وێنە | Click to Add |
| --- | --- | --- |
| 1 | Bitmap Image | |
| 2 | Package | |
| (New) | | |

دواتر Paste دەکەین

**دواتر لەکاتی درووستکردنی فۆرم دا ئەنجامەکەی دەبینین .**

# ڕێگەی دووەم

کلیکی ڕاست لەسەر خانەکە دەکەین و Insert Object هەڵدەبژێرین  دواتر بۆکسێك دەکرێتەوە Bitmap Image هەڵدەبژێرین ئەگەر وێنەمان داخلکرد دواتر بەرنامەی Paint دەکرێتەوە لەلای چەپی بەرنامەکە کلیك لەسەر  Paste دواتر Paste From هەڵدەبژێرین دواتر وێنەکە دیاری دەکەین  بەرنامەکە دادەخەین .

Table1

| ID | وێنە | Click to Add |
|---|---|---|
| 1 | Bitmap Image | |
| 2 | | |
| 3 | | |
| 4 | | |
| (New) | | |

کلیك ڕاست دەکەین و Inset Object هەڵدەبژێرین




بۆ دانانی وینە هەڵدەبژێرین دواتر OK دەکەین.




دواتر بەرنامەی Paint دەکرێتەوە کلیك لەسەر **Paste**دەکەین و Paste From دەکەین وێنەکە هەڵدەبژێرین و بەرنامەکە دادەخەین

**ئەنجامی کارەکە لەکاتی دروستکردنی Form دا دەبینرێت**

**ئاگاداربە نابێ قەبارەی وێنەکە لە٧٠٠ KB زیاتر بێت .**

# Hyperlink

## جۆرێکی داتایە بەکاردێت بۆ دانانی لینکی ماڵپەڕ وسایتەکان.

سەرتا جۆری داتاکە دیاری دەکەین لەباری Design View دواتر لەباری Data sheet View خانەکە دیاری دەکەین وناوی ماڵپەڕەکە دەنووسن .

| لینک | link | Click to Add |
|---|---|---|
| دانی ئەم سایتە بکە | www.gooogle. | |
| | www.k24.com | |

سایتەکە دەنووسین

# Calculated

**جۆرێکی داتایە بۆ ئەنجامی کردارە بیرکارییەکان بەکاردێ .**

**لەم نموونەدا دەمانەوێ نرخی بەرهەم لەگەڵ ژمارەی بەرهەم لیکدان بکەین لە نرخی گشتی دایبنێین .**

مارکێتی هەستی

داتاکە دیاری

| Field Name | |
|---|---|
| ID | AutoNumber |
| ناوی بەرهەم | Short Text |
| نرخی بەرهەم | Currency |
| ژمارەی دانە | Number |
| ئەنجامی گشتی | Calculated |

Expression Builder

Enter an Expression to calculate the value of the calculated column:
(Examples of expressions include [field1] + [field2] and [field1] < 5)

[نرخی بەرهەم] * [ژمارەی دانە]

OK | Cancel | Help | << Less

Expression Elements: مارکێتی هەستی, Functions, Constants, Operators

Expression Categories: ID, ناوی بەرهەم, نرخی بەرهەم, ژمارەی دانە, ئەنجامی گشتی

Expression Values: <Value>

مارکێتی هەستی

| ID | ناوی بەرهەم | نرخی بەرهەم | ژمارەی دانە | ئەنجامی گشتی | Click to Add |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | | $11.00 | 3 | $33.00 | |
| 2 | | $22.00 | 5 | $110.00 | |
| 3 | | $77.00 | 2 | $154.00 | |
| (New) | | $0.00 | 0 | | |

**١١ * ٣ = ٣٣**

# Lookup Wizard

جۆرێکی داتایە بەکاردێ بۆ درووستکردنی کۆمبۆ بۆکس بۆ نموونە ستوونێکمان هەبێ بەناوی ڕەگەز کاتێك کلیکی لەسەر دەکەین پێمان بڵێت نێر یان مێ هەڵدەبژێریت .

| | Field Name | Da… |
|---|---|---|
| | ID | AutoNumb… |
| | ناو | Short Text |
| | تەمەن | Number |
| | ڕەگەز | Short Text |

داتا دیاری دەکەین

Lookup Wizard

This wizard creates a lookup field, which displays a list of values you can choose from. How do you want your lookup field to get its values?

- I want the lookup field to get the values from another table or query.
- I will type in the values that I want.

Cancel | < Back | Next > | Finish

Lookup Wizard

What values do you want to see in your lookup field? Enter the number of columns you want in the list, and then type the values you want in each cell.

To adjust the width of a column, drag its right edge to the width you want, or double-click the right edge of the column heading to get the best fit.

Number of columns: 1

| Col1 |
|---|
| نێر |
| مێ |

لێرەدا ڕەگەزەکە دیاری

Cancel | < Back | Next > | Finish

Lookup Wizard

واتە تەنها ئەو دوونرخە بێت

What label would y...

ڕەگەز

Do you want to limit entries to the choices?

Limit To List

Do you want to store multiple values for this lookup?

Allow Multiple Values

Those are all the answers the wizard needs to create your lookup field.

زیاد لەنرخێك دیاری بکەین

Cancel | < Back | Next > | Finish

# Primary key

Primary Key تایبەتمەندیەکی ناوازەیە کە لە داتابەیس دا بەکاردێ کە بەهۆیەوە دەتوانین ناوی دوبارە یان ژمارەی دووبارە نەهێڵدرێت یان بۆ نەهێشتنی ڕیزی بەتاڵ .

باری Design View

Table1

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | Number |
| ناو | Short Text |
| تەمەن | Number |
| ڕەگەز | Short Text |

دواتر ئەو ستوونە دیاری دەکەین کە دەمانەوێ بۆ Primary key دابنێین



دواتر تەیبڵەکەمان دەبەینە باری Data Sheet View

Table1

| ID | ناو | تەمەن | ڕەگەز | Click to Add |
|---|---|---|---|---|
| 1 | محمد فایەق | 19 | نێر | |
| 2 | هەستی کەمال | 23 | مێ | |
| 2 | کەیوان | 20 | نێر | |
| 0 | | 0 | | |

**لێرەدا من ID کردووە بە Primary Key دەبینن دووجار ژمارە ٢ نووسیوە بۆیە کاتێك دەمەوێ تەیبڵەکەم خەزن بکەم ئەم وێنەیەی خوارەوە پیشان دەدات ،**

**یان کاتێك ڕیزی بەتاڵم جێهێشتبێ لە سوونی ID دا .**




**واتە دوو جار ژمارە ٢ دووبارە بووەتەوە**

# Default value and Decimal places

له باری Design view كاتێكی داتا تایپی currency دیاری دەكەین دووبەشی گرنگی تێدایە ئەویش default value و decimal places.

Decimal places بەكاردێت بۆدیاریكردنی ژمارەی سفرەكانی ژمارەیەكی تەواو بۆ نموونە ١٥٥,٠٠٠ ئەبینین سێ سفر لەدوای ١٥٥دا هەیە.

Default value بەكاردێت بۆدانانی ئەو بڕی مووچەیەی یان ئەو ژمارەیەی دیاری دەكەین بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ بۆنموونە من ژمارە ٥٠٠ دیاری دەكەم كاتێك ناوی هەركارمەندێك دەنووسم ڕاستەوخۆ لەفیلْدی مووچە ٥٠٠،٠٠٠زیاد دەكات .

| | |
|---|---|
| ID | Short Text |
| موچه | Currency |

General | Lookup

| | |
|---|---|
| Format | Currency |
| Decimal Places | Auto |
| Input Mask | |
| Caption | |
| Default Value | 500 |
| Validation Rule | |
| Validation Text | |
| Required | No |
| Indexed | No |
| Text Align | General |

دواتر تەیبڵەكە دبەینەباری Data sheet view ئەنجامی كارەكە دەبینین .

# Field Size

Field Size واتە قەبارەی ئەو فیلْدەی کەئێمە هەمانە تا چەند پیت یان تا چەند ژمارە وەربگرێت .

سەرەتا دەچینە بەشی Design view من لێرەدا داتاتایپی short text بۆ فیلْدەکەم هەلْبژاردووە

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | Short Text |
| موجه | Currency |

ئەو ژمارەیە دیاریدەکەین کەدەمانەوێ ئەوەندە پیت بنووسین

General | Lookup

| | |
|---|---|
| Field Size | 255 |
| Format | |
| Input Mask | |
| Caption | |
| Default Value | |
| Validation Rule | |
| Validation Text | |
| Required | Yes |
| Allow Zero Length | Yes |
| Indexed | Yes (No Duplicates) |
| Unicode Compression | No |
| IME Mode | No Control |
| IME Sentence Mode | None |
| Text Align | General |

**واباشترە ژمارەکەبەپێی پێویست بێت بۆ ئەوەی قەبارەی فایلی داتابەیسەکە زۆر نەبێت .**

# Input Mask

Input Mask بەكاردێت بۆ پێدانی مەرجێك بەخانەیەك بۆ نموونە من دەمەوێ ژمارەی تەلەفۆنی كەسێك داخل بكەم هەموو ژمارە تەلەفۆنێك لە ١١ ڕەنووس پێكدێت كاتێك من ژماریەك كەمتر یان زیاتر داخل بكەم قبوڵی نەكات .

من لێرەدا فیلْدی مۆبایل داتاتایپی Number هەڵبژاردووە

| General | Lookup |
| --- | --- |
| Field Size | Long Integer |
| Format | |
| Decimal Places | Auto |
| Input Mask | 00000000000 |
| Caption | |
| Default Value | 0 |
| Validation Rule | |
| Validation Text | |
| Required | Yes |
| Indexed | Yes (No Dupl |
| Text Align | General |

١١ سفرم نوسیوە واتە تەنها ١١ڕەنووس وەربگرێت

دواتر تەیبڵەكە دەبەینە باری Data Sheet View دەبینین لەیەكەم خانەی فیلْدی مۆبایل ١١ (- - - - - - - - - - - -) هێمای ئاوا دەبینین واتە دەتوانین تاوەكو ١١ ژمارەی مۆبایل داخل بكەین بۆنموونە ٠٧٧٠ ٤٤٥٦٧٥٨

Table1

| مۆبایل | موجە |
| --- | --- |
| | $500.00 |
| | $500.00 |
| 0 | $500.00 |

١١ڕەنووس كەمتر یان زیاتر وەرناگرێت

مەرج نیە هەموو داتاتایپەكان ئەمەی بەشەی تێدا بێت

# Format

بەشێکی دیکەی گرنگە لە زۆربەی داتاتایپەکاندا هەیە بەکاردێ بۆ دیاریکردنی چۆنیەتی دەرکەوتنی ئەوشتەی کەتۆ داخلی دەکەیت بەپێی جۆری داتاتایپەکە بۆ نموونە ئەگەر فیلْدی( ڕای تۆ) مان هەبێ بمانەوی چۆن ئەو فیلْدە داتاکانی تێدا خەزن بکەین بەم شێوەیە ( yes/no یان true /false یان on/off) ئەبینین بەسێ شێوەیە دەتوانین داتای ئەو فیلْدە داخل بکەین کەخۆمان یەکێك یان دیاری دەکەین ئەگەر ئێمەداتای (yes/no) هەڵبژێرین ئەوا بەشێوەی چوارگۆشە دەردەکەوێ هێمای ڕاستی لێبدەین یان نا, شێوەکانی تریش خۆت تاقیکەوە .

General | Lookup

| | |
|---|---|
| Field Size | Long Integer |
| Format | |
| Decimal Places | Auto |
| Input Mask | 00000000000 |
| Caption | |
| Default Value | 0 |
| Validation Rule | |
| Validation Text | |
| Required | No |
| Indexed | No |
| Text Align | General |

سەرەتا داتاتایپەکە دیاریبکە دواتر گرتە لەسەر ئەم کۆبۆبۆکسە بکەو شێوازێك هەڵبژێرە.

دواتر تیبلەکە ببە باری data sheet view

Table1

| | مۆبایل | موجە | ڕای تۆ |
|---|---|---|---|
| | | $500.00 | ☐ |
| | | $500.00 | ☐ |
| * | 0 | $500.00 | ☐ |

# Validation Rule

بەشێکی هەرە گرنگە کەلە هەندێك لە داتاتایپەماندا هەیە ،کەدەتوانین بەکاری بێنێن بۆ دانانی مەرج لەسەر خانەکان .

بۆنموونە من دەمەوێ لەفیلْدی تەمەن دا بەکاری بێنم ئەوکەسەی کە داخلی بکە دەبێت لە ٢٠سال گەورەتربێت .

| Field Name | Data Type | Description (Optional) |
|---|---|---|
| مۆبایل | Number | |
| موچە | Currency | |
| ڕای تۆ | Yes/No | |
| تەمەن | Number | |

سەرەتا جۆری داتاتایپ دیاری دەکەین

Field Properties

General | Lookup

| | |
|---|---|
| Field Size | Long Integer |
| Format | |
| Decimal Places | Auto |
| Input Mask | |
| Caption | |
| Default Value | 0 |
| Validation Rule | |
| Validation Text | |
| Required | No |
| Indexed | No |
| Text Align | General |

گرتە لەسەر ئەم کۆمبۆبۆکسە دەکەین ویندۆیەك دەکرێتەوە




دواتر تەیبڵەکە دەبەینە باری Data Sheet View کاتێك ئێمە ژمارەیەك کەلەخواری داخل دەکەین ئەم وێنەیە پێشان دەدات

Table1

| مۆبایل | موچە | ڕای تۆ | تەمەن |
|---|---|---|---|
| | $500.00 | ☐ | 20 |
| | $500.00 | ☐ | 12 |
| 0 | $500.00 | ☐ | 0 |

ژمارە ١٢ داخل کردووە

Microsoft Access

One or more values are prohibited by the validation rule '>=20' set for 'Table1.تەمەن'. Enter a value that the expression for this field can accept.

OK Help

من لێرەدا ژمارە ١٢ داخل کردووە بەپێی مەرجەکەش ناگونجێ دەبێت تەنها لە٢٠ وە سەرووتر داخل بکەم .

ئەگەر بمانەوێ کاتێك مەرجەکە نەگونجا بەشێوەی نامە پێمان بڵێ تەمەنەکە لەگەڵ مەرجەکەدا ناگونجێ ئەوا لە Validation Text دا ئەو ڕستیەیە دەنووسین کەدەمانەوێ بەشێوەی نامە پێشانمان بدات .

| | |
|---|---|
| مۆبایل | Number |
| موچە | Currency |
| ڕای تۆ | Yes/No |
| تەمەن | Number |

نامەکە لێرەدا دەنووسم کەدەمەوێ پیشانم دا

General | Lookup

| | |
|---|---|
| Field Size | Long Integer |
| Format | |
| Decimal Places | Auto |
| Input Mask | |
| Caption | |
| Default Value | 0 |
| Validation Rule | >=20 |
| Validation Text | تکایە تەمەنی ٢٠ یان سەرووو داخل بکە |
| Required | No |
| Indexed | No |
| Text Align | General |

تەیبڵەکە دەبەینە باری Data Sheet View

Table1

| مۆبایل | موچە | ڕای تۆ | تەمەن |
|---|---|---|---|
| | $500.00 | ☐ | 20 |
| | $500.00 | ☐ | 12 |
| 0 | $500.00 | ☐ | 0 |

Microsoft Access

تکایە تەمەنی ٢٠ یان سەرووو داخل بکە

OK | Help

کاتێك ژمارە ١٢ لەگەڵ مەرجی فێڵدەکەدا ناگونجێ ئەم نامەیەم پیشان دەدات .

# Indexed

تایبەتمەندیەکی دیکەیە لەهەندێك لە داتاتایپەکاندا هەیە کەلەڕێگەیەوە دەتوانین ڕێگە بەناوی دووبارە بدەین لەفیلڵدیکدا یان ڕێگەی پێنەدەین .

- من لێرەدا فیڵدی ناو هەڵدەبژێرم و دەمەوێ ئەم تایبەتمەندیە تێیدا بەکاربێنم .

General | Lookup

| | |
|---|---|
| Field Size | 255 |
| Format | |
| Input Mask | 00000000000 |
| Caption | |
| Default Value | |
| Validation Rule | |
| Validation Text | |
| Required | No |
| Allow Zero Length | Yes |
| Indexed | No |
| Unicode Compression | No |
| IME Mode | No Control |
| IME Sentence Mode | None |
| Text Align | General |

سەرەتا داتاتایپی فیڵدەکە دیاری دەکەم و گرتە لەسەر ئەم کۆمبۆبۆکسە دەکەم

دوای گرتەکە ئەگەر Yes(Duplicate Ok) هەڵبژێرم ئەوا دەتوانم ناوی دووبارە بەکاربێنم .

دوای گرتەکە ئەگەر Yes(No Duplicate) هەڵبژێرم ئەوا ناتوانم ناوی دووبارە بەکاربێنم .

Yes(No Duplicate)من لێرەدا ئەم جۆرە بەکاردێنم.




**لەبەر ئەوەی من Yes (No Duplicate) هەڵبژاردووە کەواتە ناتوانم ناوی دووبارە بەکاربێنم بۆیە ئەم نامەیەم پیشان دەدات و پێم دەڵێت ناتوانی دووجار ناوی (ئاکار ) لە هەمان فیلْدا بەکاربێنیت .**

# Query

Query پێکهاتەیەکی سەرەکی داتابەیسە کە بەمانای پرسیار یان داواکاری دێت ئێمە بە هۆی Query یەوە دەتوانین ئەو داتا و زانیاریەی کەهەمانە بتوانین شیکردنەوە بۆبکەین بۆ نموونە ئەگەر تەیبلێکمان هەبێت بزانین چەند کەس خەڵکی کەلارە ئەوا Query ئەم کارەمان بۆدەکات یان دەتوانین ئەنجام دانی کرداره بیرکاریەکان یان دانانی مەرج لەسەر خانەکان .

تێبینی // هەموو Query یەك پشت بە خشتە دەبەستێت واتە دەبێت تۆسەرەتا خشتەت هەبێت دواتر دەتوانیت Query بەکاربێنیت .

## درووستـکـرنـی Query

بەدوو رێـگـە دەتـوانـین کـویری درووسـت بـکـەین .

Query Wizard-١

Query Disign-٢

# Query Wizard

ڕێگەی یەکەمی دروستکردنی Query سەرەتا خشتەیەك دروست دەکەین دواتر دەچینە سەر بەشی Creat لەسەرەوە دواتر گرتە لەسەر Query Wizard دەکەین




دواتر ئەم وێنەیە دەکرێتەوە کە ٥ شێوازی دروستکردنی Query پیشان دەدات بەڵام جۆری Simple Query هەڵدەبژێرین و گرتەی لەسەردەکەین .



**دوای ئەوەی OK کرد ئەم وێنەیە دەکرێتەوە**




**هێمای > دانەبەدانەی فیلّدەکان داخلی Query دەکات .**

**هێمای>> هەموو فیلّدەکان بەیەکجار داخلی Query دەکات.**

**هێمای< دانەبەدانەی فیلّدەکان لەناو Query لادەبات .**

**هێمای << هەموو فیلّدەکانی ناو Query بەیەکجار لادەبات .**

**دواتر Next دەکەین دواتر ویندۆیەکی تردەکرێتەوە Finsh دەکەین کوێریەکەمان بەشێوەی خشتە پیشان دەدات.**

**تێبینی//ئەگەر بمانەوێ کوێریەکەمان بسڕینەوە دەبێت سەرەتا دابخەین**

# Query Design

ڕێگای دووەمی درووستکردنی Query سەرەتا گرتە لەسەر Creat دەکەین دواتر لەسەر Query Design گرتە دەکەین ویندۆیەك دەکرێتەوە .




دواتر ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە



## دواتر لەخوارەوە ویندۆیەکە ئەم کارانە دەکەین

Field:
Table:
Sort:
Show:
Criteria:
or:

Field // گرتە لەسەر کۆمبۆبۆکسەکە دەکەین ناوی ئەو فیلّدە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ Query لەسەر بکەین وا باشترە هەمووی دیاری بکەین .

Table // ناوی ئەو تەیبلّەی کە Query لەسەر دەکەین .

Sort // بۆ ڕیزکرنی فیلّدەکان بەکاردێت .

Show // بۆ پیشاندانی فیلّدەکانە واباشترە هەمووی هێمای ڕاستی لێبدرێت .

Criteria // لێرەدا ئەو مەرج و داواکارییانە دەنووسین کەدەمانەوێ بۆمان بکات .

Or // بۆ چەند کارێکی دیکە بەکاردێت دواتر باسیان دەکەین.



# بەکارهێنانی مەرج لە Query

دەبێت سەرەتا Query درووست بکەین و بچینە بەشی Design View کویریەکە






دواتر ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە لە بەشی Criteria مەرجەکە دەنووسین بونموونە لەفیلْدی ڕەگەز دەنووسین (نێر) و Enter دەکەین دواتر لەبەشی سەرەرەوە Run دەکەین تەنها ئەوکەسانەمان پیشان دەدات کەنێرن

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Field: | ID | ناو | ماڵەوە | شوێنی نیشتەجێبوون | ڕەگەز | باری خێزانی |
| Table: | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان |
| Sort: | | | | | | |
| Show: | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ |
| Criteria: | | | | | "نێر" | |
| or: | | | | | | |

دواتر Run دەکەین دەبینین تەنها ئەوکەسانە پیشاندەدات کەنێرن

قوتابیان Query

| ID | ناو | ماڵەوە | شوێنی نیشتەجێبوون | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | محمد | بەشە ناوخۆی | ڕانیە | نێر | سەڵت |
| 2 | علی | ناو شار | کەلار | نێر | خێزاندار |
| 6 | ئەحمەد | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 7 | سۆران | ناوشار | کەلار | نێر | سەڵت |
| (New) | | | | | |

**تێبینی //دەتوانین زیاد لە یەك مەرج لە Query دا بەکاربێنین بۆنموونە دیاری بکەین چەند کەس ڕەگەزی (مێیە) و خەڵکی (کەلار) ە .**

| Field: | ID | ناو | مانەوە | شوێنی نیشتەجێبوون | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Table: | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان |
| Sort: | | | | | | |
| Show: | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ |
| Criteria: | | | | "کەلار" | "مێ" | |
| or: | | | | | | |

**مەرجەکە لەبەشی Criteria دەنووسین دواتر Run دەکەین .**

قوتابیان Query

| ID | ناو | مانەوە | شوێنی نیشتەجێبوون | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|
| 3 | شیرین | ناوشار | کەلار | مێ | سەڵت |
| 4 | زاکاو | ناوشار | کەلار | مێ | خێزاندار |
| 8 | سۆما | ناوشار | کەلار | مێ | سەڵت |
| (New) | | | | | |

**دەبینین ئەوەی ڕەگەزی مێیە و خەڵکی کەلارە دیاریکردووە**

# بەکارهێنانی دوو مەرج لەسەر یەك فیلْد

ئێمە دەتوانین دوو مەرج لەسەر یەك فیلْد بەکاربێنین بۆ نموونە ئەگەر بمانەوی ئەو کەسانە دیاری بکەین کەخەڵکی کەلار و سلێمانین .

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Field: | ID | ناو | مانەوە | شوێنی نیشتەجێبوون | ڕەگەز | باری خێزانی |
| Table: | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان |
| Sort: | | | | | | |
| Show: | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ |
| Criteria: | | | | "کەلار" | | |
| or: | | | | "سلێمانی" | | |

واتە خەڵکی کەلار و سلێمانی دیاری بکە

دواتر لەسەرەوە لەبەشی دیزاین Run ( ! ) دەکەین .

قوتابیان Query | قوتابیان

| ID | ناو | مانەوە | شوێنی نیشتەجێبو | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|
| 2 | علی | ناو شار | کەلار | نێر | خێزاندار |
| 3 | شیرین | ناوشار | کەلار | مێ | سەڵت |
| 4 | ژاکاو | ناوشار | کەلار | مێ | خێزاندار |
| 6 | ئەحمەد | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 7 | سۆران | ناوشار | کەلار | نێر | سەڵت |
| 8 | سۆما | ناوشار | کەلار | مێ | سەڵت |
| 9 | کامەران | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 10 | یاسین | | سلێمانی | نێر | خێزاندار |
| 11 | شنۆ | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | مێ | سەڵت |
| (New) | | | | | |

دەبینین تەنها خەڵکی کەلار و سلێمانی دیاریکردووە .

**تێبینی // ئەگەر ناوی قوتابیەکی کە بۆ تەیبڵەکەمان زیاد بکەین کە خەڵکی کەلار بێت لەبەر ئەوەی مەرجەکەی لەسەر جێبەجی دەبێت کەواتە ناوی قوتابەیەکە دێتە ناو** Query .

قوتابیان

| ID | ناو | ماڵەوە | شوێنی نیشتەجێبو | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | محمد | بەشە ناوخۆی | ڕانیە | نێر | سەڵت |
| 2 | علی | ناو شار | کەلار | نێر | خێزاندار |
| 3 | شیرین | ناوشار | کەلار | مێ | سەڵت |
| 4 | ژاکاو | ناوشار | کەلار | مێ | خێزاندار |
| 5 | نەرمین | بەشە ناوخۆی | دەربەندیخان | مێ | سەڵت |
| 6 | ئەحمەد | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 7 | سۆران | ناوشار | کەلار | نێر | سەڵت |
| 8 | سۆما | ناوشار | کەلار | مێ | سەڵت |
| 9 | کامەران | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 10 | یاسین | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | خێزاندار |
| 11 | شنۆ | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | مێ | سەڵت |
| 12 | ساکار | ناو شار | کەلار | مێ | سەڵت |

من لێرەدا ناوی (ساکار) م داخلی تەیبڵەکە کردووە کە خەڵکی کەلارە بەمەش لەگەڵ مەرجی Query ەکەدا دەگونجێ .

دواتر دەچین Query ەکەمان دەکەینەوە لەبەشی Home دا لەسەرەوەدا کلیك لەسەر Refreshدەکەین دەبینین ناوی ( ساکار ) دێتە ناو Query ەکە .

| ID | ناو | مانەوه | شوێنی نیشتەجێبو | ڕەگەز | باری خێزانی |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| 2 | علی | ناو شار | کەلار | نێر | خێزاندار |
| 3 | شیرین | ناوشار | کەلار | مێ | سەڵت |
| 4 | ژاکاو | ناوشار | کەلار | مێ | خێزاندار |
| 6 | ئەحمەد | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 7 | سۆران | ناوشار | کەلار | نێر | سەڵت |
| 8 | سۆما | ناوشار | کەلار | مێ | سەڵت |
| 9 | کامەران | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 10 | یاسین | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | نێر | خێزاندار |
| 11 | شنۆ | بەشە ناوخۆی | سلێمانی | مێ | سەڵت |
| 12 | ساکار | ناو شار | کەلار | مێ | سەڵت |
| (New) | | | | | |

دەبینین پاش ئەوەی گرتەمان لەسەر Refresh دەکەین دەبینین ناوی ( ساکار) داخلی Query ەکە دەبێت چونکە خەڵکی کەلارە کەواتە لەگەڵ مەرجی Query دەگونجێت .

# کرداره بیرکاریەکان لە Query

ئێمە دەتوانین کرداره بیرکاریەکان ئەنجام بدەین لە Query دا لەسەر هەرفیلڵدێك کەخۆمان بمانەوێ .

سەرەتا کلیکی ڕاست لەسەر Query ەکە دەکەین و Design View هەڵدەبژێرین کە ویندۆیەکە دەکرێتەوە لەخوارەوە لە بەشی Criteria هەرفیلڵدێك مەرجە بیرکاریەکە دەنووسین.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Field: | ID | ناو | مووچە | شوێنی نیشتەجێبوون | ڕەگەز | باری خێزانی |
| Table: | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران |
| Sort: | | | | | | |
| Show: | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ |
| Criteria: | | | >=400 | | | |
| or: | | | | | | |

کلیکی ڕاست دەکەین و Build هەڵدەبژێرین دەبینین هەموو کرداره بیرکاریەکان پیشاندەدرێت




لێرەدا مەبەستمانە هەموو ئەو فەرمانبەرانە پیشان بدات کە مووچەکەی لە ٤٠٠ هەزار بەرەوسەرەوەیە دواتر گرتە لەسەر( ! ) Run دەکەین .

Query فەرمانبەران

| ID | ناو | مووچە | شوێنی نیشتەجێبو | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|
| 2 | علی | $555.00 | کەلار | نێر | خێزاندار |
| 3 | شیرین | $450.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| 4 | ژاکاو | $887.00 | کەلار | مێ | خێزاندار |
| 6 | ئەحمەد | $767.00 | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 7 | سۆران | $565.00 | کەلار | نێر | سەڵت |
| 8 | سۆما | $445.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| 9 | کامەران | $676.00 | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 10 | یاسین | $456.00 | سلێمانی | نێر | خێزاندار |
| 11 | شنۆ | $997.00 | سلێمانی | مێ | سەڵت |
| 12 | ساکار | $1,000.00 | کەلار | مێ | سەڵت |

هەموو ئەو فەرمانبەرانەی مووچەکەی ٤٠٠ هەزار بەرەو سەرەوەیە .

# ڕیزکردن لە Query

کاتێك ئێمە مەرجێك لەسەر فیلْدێکی Query دەنووسین ئەگەر بمانەوێ ئەنجامی ئەو کویریە بەپێی ڕیزبەندی حەرفی ئەبجەدی ناوەکان پیشان بدەین ئاوا دەتوانین کرداری ڕیزکردن بەکاربێنین سەرەتا کویریەکە دەبەینە باری Design View :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Field: | ID | ناو | مووچە | شوێنی نیشتەجێبوون | ڕەگەز | باری خێزانی |
| Table: | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران |
| Sort: | | | | | | |
| Show: | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ |
| Criteria: | | | >=400 | | | |
| or: | | | | | | |

Ascending هەڵدەبژێرین

لەبەشی Sort دا کلیك لەسەر کۆمبۆبۆکسەکە دەکەین و Ascending هەڵدەبژێرین دواتر کویریەکە Run دەکەین .

**دەبینین کویریکەمان کرداری ڕیزکردنی بەسەردا هاتووە**

فەرمانبەران Query

| ID | ناو | مووچە | شوێنی نیشتەجێبو | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|
| 6 | ئەحمەد | $767.00 | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 4 | ژاکاو | $887.00 | کەلار | مێ | خێزاندار |
| 12 | ساکار | $1,000.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| 7 | سۆران | $565.00 | کەلار | نێر | سەڵت |
| 8 | سۆما | $445.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| 11 | شنۆ | $997.00 | سلێمانی | مێ | سەڵت |
| 3 | شیرین | $450.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| 2 | علی | $555.00 | کەلار | نێر | خێزاندار |
| 9 | کامەران | $676.00 | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 10 | یاسین | $456.00 | سلێمانی | نێر | خێزاندار |
| (New) | | $0.00 | | | |

**تێبینی // هەر Query یەك كاتێك Runدەكەین دەتوانین شێوەكەی یان ڕەنگەكەی بگۆڕین یان ڕیزی بكەین بەدڵی خۆمان .**

# Update Query

کاتێك ئێمە کویریەکمان هەبێت بمانەوێ گۆڕانکاری بەسەر داتاکانی فیلْدێکدا بێنین ئەوا دەتوانین ئاپدەیتی ئەو فیلْدەبکەین بۆ نموونە ئەگەر کەسێك مووچەکەی لە ٤٠٠ هەزار کەمتر بوو بمانەوێ بیکەینە ٦٠٠ هەزار .




لەبەشی Update To داتا تازەکە دیاری دەکەین بۆ نموونە ٦٠٠ هەزار .

لەبەشی Criteria مەرجەکە دەنووسین بۆنموونە کەمتر لە ٤٠٠ هەزار <٤٠٠ .

دواتر Run دەکەین و ئەنجامەکەی دەبینین .

# سڕینەوە لە Query دا

لە Query دا دەتوانین هەر خانەیەکمان بوێت بیسڕینەوە ئەویش بەدانانی مەرج لەسەر خانەکان ، بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێ ئەو کەسانەی کە خەڵکی کەلارن بیان سڕینەوە .

سەرەتا Query درووست دەکەین دواتر دەیبەینە باری Design View




تەنها لە بەشی (Criteria) ی نیشتەجێبوون دەنووسین کەلار و Enter دەکەین دواتر لەلای چەپی شاشەکە نووسراوە Query فەرمانبەران کلیکی ڕاست دەکەین و Open دەکەین و ئەنجامەکەی دەبینین .

# ناردنی فیڵد لە Query دا

ئێمە دەتوانین داتای فیڵدێك لەتەیبڵێك دا بنێرین بۆ ناو فیڵدێکی دیکە لەتەیبڵێکی دیدا .

دوو تەیبڵم هەیە بەناوی **1** Table و**2** Table دەمەوێناوەکانی ناو **1** Table بنێرم بۆ ناو

فیڵدی )ناو( لەناو Table**2** سەرەتا کویریەك درووست دەکەم لە**1** Table



سەرەتا کلیکی لەسەر ئەمە دەکەم




دواتر ئەمەی خوارەوە پیشان دەدات






دواتر هەمووی خەزن دەکەین و دایدەخەین .

دواتر دەبڵ كليك لەسەر کویریەکە دەکەین و Ok دەکەین .

دواتر ئەو تەیبڵەکەکەینەوە کە داتاکانمان بۆ ناردووە لێرەدا Table **2** داتا وەردەگرێ .



# درووست كردنی تەیبڵ لەناو Query دا

دەتوانین تەیبڵ لەسەر ئەو Query درووست بكەین كەدرووست مان كردووە سەرەتا كویریەكە درووست دەكەین Design View دەیبەینە باری .

سەرەتا كليك لەسەر ئەمە دەكەم



كاتێك كلیك لەسەر Make Table دەكەم ئەم ویندۆیە دەكرێتەوە

ناوی تەیبڵەكە

Make Table

Make New Table

Table Name:

Current Database

Another Database:

File Name:

Browse...

OK

Cancel

دواتر كویریەكە و تەیبڵەكەش خزن دەكەین و دواتر دایدەخەین

قوتابیان | قوتابیان Query

قوتابیان

*

ID

ناو

مووچە

شوێنی نیشتەجێبوون

ڕەگەز

كلیكی ڕاست دواتر Save دووبارە كلیكی ڕاست دواتر Close

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Field: | [ID] | [ناو] | [مووچە] | [شوێنی نیشتەجێبوون] | [ڕەگەز] | [باری خێزانی] |
| Table: | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان |
| Sort: | | | | | | |
| Show: | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ |
| Criteria: | | | | | | |
| or: | | | | | | |

دواتر دەبڵ کلیك لەسەر کویریەکە دەکەین دواتر دووجار Yes دەکەین دواتر دەبینین تەیبڵە تازەکە زیادبووە لێرەدا ناوی نەخۆشە دەیکەینەوە دەبینین داتاکانی تێدایە




تەیبڵە تازەکە

نەخۆش

| ID | ناو | مووچە | شوێنی نیشتەجێبو | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | محمد | $334.00 | ڕانیە | نێر | سەڵت |
| 2 | علی | $555.00 | کەلار | نێر | خێزاندار |
| 3 | شیرین | $450.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| 4 | ژاکاو | $887.00 | کەلار | مێ | خێزاندار |
| 5 | نەرمین | $333.00 | دەربەندیخان | مێ | سەڵت |
| 6 | ئەحمەد | $767.00 | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 7 | سۆران | $565.00 | کەلار | نێر | سەڵت |
| 8 | سۆما | $445.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| 9 | کامەران | $676.00 | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 10 | یاسین | $456.00 | سلێمانی | نێر | خێزاندار |
| 11 | شنۆ | $997.00 | سلێمانی | مێ | سەڵت |
| 12 | ساکار | $1,000.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| (New) | | | | | |

# بەکارهێنانی ژمارەی ID

**دەتوانین بەبەکارهێنانی ژمارەی ID هەرخانەیەکی ناو Query پیشان بدەین بۆ نموونە ئایدی ژمارە ۱ ڕاستەخۆ هەموو داتاکانی ناو ئەو خانەیە پیشان بدات تەنها ئەو خانەیە .**

سەرەتا Query درووست دەکەین دەیبەینە باری Design View.

قوتابیان Query

قوتابیان
*
ID
ناو
مووچە
شوێنی نیشتەجێبوون
ڕەگەز

**بەپێی فیلْدی ID ئەم مەرجە دەنووسین پێشتر کەتەیبلْەکە درووست دەکەین ئەم فیلْدە درووست دەکەین و بۆ هەر خانەیەك ژمارە دادەنێین .**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Field: | ID | ناو | مووچە | شوێنی نیشتەجێبوون | ڕەگەز | باری خێزانی |
| Table: | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان | قوتابیان |
| Sort: | | | | | | |
| Show: | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ | ☑ |
| Criteria: | [تکایە ژمارەی IDبنووسە] | | | | | |
| or: | | | | | | |

بەشی(Criteria)ی ئایدی

لەبەشی (Criteria)ی ئایدی  دا دەنووسین [تکایە ID چوونە ژوورەوە بنووسە ] دواتر کویریەکە خەزن دەکەم دواتر دایدەخەم دواتر کویریەکە   .




**کاتێك کویریەکە دەکەمەوە پێم دەڵێ ژمارەیIDداخل بکە**




**کاتێك ژمارەی ID داخل دەکەم داتای ناو ئەو خانەیە پیشان دەدات**

# جیاكردنەوەی داتاكان لە Query دا

ئەو داتایانەی كە هەمانە دەتوانین لەڕێگەی Crosstab كەبەشێكە لەناو Query دایە بتوانین دانەبەدانەی شیبكەینەوە  بۆنموونە ئەگەر تەیبڵێكم هەبێت بزانم چەنن كەس بڕوانامەكەی دبلۆمە چەند كەس ماستەرە ئەوانەی كە دبلۆمن كامیان مووچەكەی بەرزە ئیتر ئابەم شێوازە .

**سەرەتا** Query **ەكە درووست دەكەم و دەیبەمە باری** Design View :

دوای ئەوەی گرتەمان لەسەر Crosstab کرد دەبینین دووبەش زیاد دەبێت لەهەر فیلّدێك دا

## Total-١

ئەم بەشانەی تێدایە

Sum بەکاردێت بۆ کۆکردنەوەی داتاکان ئەگەر فیلّدەکە ژمارەی تێدا بوو

Max بۆ پیشان دانی گەورەترین ژمارە

Min بۆ پیشان دانی بچووکترین ژمارە

Avg بەکاردێ بۆ دەرکردنی بەرئەنجام

Count بەکاردێت بۆ ژماردن

..... هتد

## Crosstab-٢

Row heading داتاکان بەشێوەی خانەخانە پیشان بدات

Column heading داتاکان بەشێوەی ڕیز ڕیز پیشان بدات

Value داتاکان بەشێوەی بەها پیشان بدات ئەگەر فیلّدەکە ژمارەی تێدا بوو

Non show هیچ پیشان نەدات

دەبێت بەکارهێنانی Row heading لەگەڵ Column heading وەکو یەك بەکاریان بێنین

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Field: | ناو | مووچە | ڕەگەز | |
| Table: | فەرمانبەران | فەرمانبەران | فەرمانبەران | |
| Total: | Group By | Count | Group By | |
| Crosstab: | Row Heading | Value | Column Heading | |
| Sort: | | | | |
| Criteria: | | | | |
| or: | | | | |

ناوەکان بەشێوەی ڕیز پیشان بدە

ڕەگەزەکان بەشێوەی ستوون پیشان بدە

لە فیلْدی مووچەدا وتوومانە ئەو کەسانەی کە هەمان ناویام هەیە بیان ژمێرە و ژمارەکەی لە ڕەگەز دا بنووسە  لەبەر ئەوەی ژماردن بەهایە Value مان بەکارهێناوە .

**دواتر** Run **دەکەین و ئەنجامەکەی دەبینین .**

فەرمانبەران | فەرمانبەران Query

| ناو | مێ | نێر |
|---|---|---|
| ژاکاو | 1 | |
| ساکار | 1 | |
| سۆما | 2 | |
| شیرین | 1 | |
| علی | | 1 |
| محمد | | 3 |
| نەرمین | 1 | |
| کامەران | | 1 |
| یاسین | | 1 |

# Required

تایبەتمەندیەکی دیکەیە لە هەندێك داتاتایپەکاندا هەیە بەکاردێت بۆ ئەوەی بەکارهێنەر ناچاربکات بەداخلکردنی داتا واتە ڕێگە بە ڕیزی بەتاڵ نادات .

سەرەتا تەیبلێك درووست دەکەین و دەیبەینە باری Design View

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| ID | AutoNumber |
| ناو | Short Text |
| مووچە | Currency |
| شوێنی نیشتەجێبوون | Short Text |
| ڕەگەز | Short Text |
| باری خێزانی | Short Text |

General | Lookup

| | |
|---|---|
| Field Size | 255 |
| Format | |
| Input Mask | |
| Caption | 1 |
| Default Value | |
| Validation Rule | |
| Validation Text | |
| Required | No |
| Allow Zero Length | Yes |
| Indexed | No |
| Unicode Compression | Yes |
| IME Mode | No Control |
| IME Sentence Mode | None |
| Text Align | General |

دەیکەینە بە Yes

## دواتر تەیبڵەکە دەبەمە باری Data Sheet View

فەرمانبەران

| ID | ناو | مووچە | شوێنی نیشتەجێبو | ڕەگەز | باری خێزانی |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | محمد | $334.00 | ڕانیە | نێر | سەڵت |
| 2 | علی | $555.00 | کەلار | نێر | خێزاندار |
| 3 | شیرین | $450.00 | کەلار | مێ | سەڵت |
| 4 | ژاکاو | $887.00 | کەلار | مێ | خێزاندار |
| 5 | | | | | |
| 6 | محمد | $767.00 | سلێمانی | نێر | سەڵت |
| 7 | محمد | $565.00 | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| 8 | سۆما | $445.00 | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| 9 | کامەران | $676.00 | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| 10 | یاسین | $456.00 | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| 11 | | | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| 12 | ساکار | $1,000.00 | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| (New) | | | [illegible] | [illegible] | [illegible] |




**دەڵێت تو ناچاری لە هەموو خانەیەك دا داتا داخل بکەیت**

# Relationship

درووست كردنی پەیوەندی لەنێوان تەیبڵەكانی داتابەیسێك دا یەكێكە لەوەكارانەی كە زۆرجار پێویست دەكات بكرێت ، كە بەو پێكەوە بەستنە دەوترێت Relationship .

ئامانج لەبەكارهێنانی Relationship ئەوەیە ڕێگری بكەین لە دووبارە بەكارهێنانەوەی داتاكان بۆ دوو تەیبڵی جیاواز بۆنموونە ئەگەر دوو تەیبڵمان هەبێت لەناو ئەم دوو تەیبڵە جیاوازەدا دوو فیڵدی وەكو یەكمان هەبێت  پێویست نەكات هەموو كات ئێمە هەموو جارێك هەمان  داتا بۆ ناو ئەم دوو فێڵدە داخل بكەین بۆیك دانەیان داخڵ بكەین ڕاستەوخۆ بۆناو ئەو فیڵدەكەی دیكەش داخل بێت .

بۆ بەستنەوەی ئەم دوو فیڵدە پێیویستە Primary Key لەگەڵ Foreign Key بەكاربێنین بۆ یەكێكیان Primary بۆ ئەوەكەی تریان Foreignبەكاردێنین  .



## دروستکردنی Relationship

هەروەکو پێشتر باسم کرد ئامانج لە دروستکردنRelationship ڕێگریکردنە لە دووبارە داخلکردنی هەمان داتا .

- پێویستە هەموو ئەو داتایەی هەمانە لە چەند تەیبڵێك دا.
- دەبێت فیڵدە دووبارە بووەکان لەناو یەك تەیبڵدا دابنێین .
- بۆ ئەوەی بتوانی ئەم کردارانە ئەنجام بدەی دەبێت باش لە Relationship تێگەشتبی .

## بۆچی Relationship بەکاردێنین

- بۆ پێکەوە بەستنی چەندکویریەك یان چەند فۆرمێك .
- بۆ پێکەوە بەستنی دوو فیڵد لەناو دوو تەیبڵی جیاواز .
- بۆپێکەوەبەستنی دووفیڵدی وەکو یەك لەناوتەیبڵی جیاوازدا بۆ دووبارەنەبوونەوەی داتای وەکو یەك بەبەکارهێنانی Foreign Key .

# جۆرەکانی Relationship

سێ جۆر Relationship هەیە :

١-One-to-One

٢-One-to-Many

٣-Many-to-Many

## One - to - One

جۆرێکی Relationship بەکاردێت بۆ پێکەوە بەستنی دوو فیلّد لەدوو تەیبڵی جیاوازدا بە بەکارهێنانی تەنها Primary Key.

ئەم جۆرە بەکارهێنانی زۆر کەمە واتە زۆر بەکەمی بەکاردێت .

تەیبلّەکانی ئەم جۆرە دابەش دەکرێت بەسەر چەند فیلّدێکدا .

لەگەڵ ئەو تەیبلاّنەدا بەکاردێت کەمەبەستمانە بۆ ماوەیەکی کاتی داتای تێدابەکاربێنین .

بۆ بەكارهێنانی ئەم جۆرە پێویستە سەرەتا دوو تەیبڵ درووست بکەین بۆ نموو تەیبڵی كارمەند و زانیاری .




دوو تەیبڵمان درووستكرد

دواتر لەسەرەوە دەچینە سەر بەشی Database Toolse .






هەرکام تەیبڵەمانە ویست Relationship بکەین سەرەتا شینی دەکەین و دواتر یەك جار Add دەکەین، من لێرەدا هەردووکیانم Add کردووە دواتر Close کردووە.

دەبینین لە هەردوو تەیبڵەکەدا فیلدیID هەیە کەواتە دەتوانم Relationship درووستکەم سەرەتاکلیکی لاچەپ لەسەر یەك دانەیان دەکەم دەستی لەسەر هەڵناگرم ئایکۆنەکە ڕادەکێشمەم بۆلای ID کەی دیکە ڕاستەوخۆ ئەم فوینۆیەی خوارەوە دەکرێتەوە .

**تەنها گرتە لەسەر Creat دەکەین**

یان لەسەرەوە گرتە لەسەر Edit Relationship دەکەین ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە و لەرێگە کۆبۆکسەکانیەوە پەیوەندیەکە دیاری دەکەین .

کاتێك گرتەمان لەسەر Creat کرد ئەم وێنەیەی خوارەوە پیشان دەدات دەبینین هێڵێك لەنێوان هەردوو ID تەیبڵەکەدا هەیە کە ئاماژەیە بەدرووست بوونی Relationship کە دواتر خەزنی دەکەین و لەسەری دەردەچین .

دواتر دەڕۆم تەیبڵی کارمەند دەکەمەوە :

کارمەند

| ID | ناو | مووچە | ناونیشان | ڕەگەز |
|---|---|---|---|---|
| 1 | محمد | $876.00 | کەلار | نێر |
| 2 | قزلول | $978.00 | کفری | مێ |
| 3 | علی | $567.00 | سلێمانی | نێر |
| 4 | ڕێباز | $796.00 | هەولێر | نێر |
| 5 | سوما | $678.00 | کەلار | مێ |
| 6 | سازگار | $567.00 | دەربەندیخان | مێ |

دەبینین لە تەنیشت هەر خانەیەك دا هێمای کۆکردنەوەیك (+) زیاد بووە ، بۆ هەرخانەیەك کلیکی لەسەر(+) دەکەم دەبینین ڕاستەوخۆ فیڵدەکانی تەیبڵەکی دیکەم پیشان دەدات کە Relationshipم لەگەڵ کردووە .

من لێرەدا ئایدی ژمارە١گرتەم لەسەر (+) ەکەی کردووە ڕاستەوخۆ فیلّدەکانی کردووەتەوە بۆ کاتژێری ئیشکردن ٤ داخل دەکەم بۆ موچەکەی ٨٧٨ هەزار داخل دەکەم بۆ ئەو خانەکانی دیکەش بەهەمان شێوە .

کارمەند

| ID | ناو | مووچە | ناونیشان | ڕەگەز |
|---|---|---|---|---|
| 1 | محمد | $876.00 | کەلار | نێر |

| کاتژێری ئیشکر | مووچە | Click to Add |
|---|---|---|
| 4 | $878.00 | |
| 0 | $0.00 | |

| ID | ناو | مووچە | ناونیشان | ڕەگەز |
|---|---|---|---|---|
| 2 | قزلول | $978.00 | کفری | مێ |
| 3 | علی | $567.00 | سلێمانی | نێر |
| 4 | ڕێباز | $796.00 | هەولێر | نێر |
| 5 | سۆما | $678.00 | کەلار | مێ |
| 6 | سازگار | $567.00 | دەربەندیخان | مێ |

خەزنی دەکەم دواتر دەچم تەیبڵەکەی دیکە دەکەمەوە

زانیاری

| ID | کاتژێری ئیشکر | مووچە |
|---|---|---|
| 1 | 4 | $878.00 |
| 2 | 1 | $879.00 |
| 3 | 2 | $75.00 |
| 4 | 2 | $444.00 |
| (New) | 0 | $0.00 |

کەتەیبلّی زانیاری دەکەمەوە دەبینین هەموو ئەو زانیاریانەی کە ناردوومە هەمووی داخل بووە بەهەمان شێوەش هێمای(+) لێرەدا هەیە کەدەتوانم بزانم ئەم زانیاریانە هین کێیە یان دەتوانم لێرەوە بەهەمان شێوە زانیاری بۆ تەیبڵەکەی دیکە بنێرە.

# One – to - Many

جۆرێکی دیکەی Relationship کەزۆر باوە بەزۆری لەداتابەیس دا بەکاردێت لەم جۆرەدا فیلّدێك لەناو تەیبلّێکدا دەبەسترێتەوە بە چەند فیلّدێك لەناو تەیبلّێکی دیکەدا دەتوانین هەمان ئەو کردارەی کەلە One-to-One دا ئەنجام ماندا لێرەشدا ئەنجامی بدەین بەلاّم لێرەدا داتا بۆ چەند فیلّدێك داخل بکەین .

بەهەمان شێوە لێرەدا دوو تەیبلّ درووست دەکەین :






من لێرەدا دوو تەیبلّم درووستکردووە

دواتر دەچمە سەر Database Toolse دواتر Relationship دواتر Show Table پاشان تەیبلّەکان شین دەکەم و یەکی یەك جار Add دەکەم .




دەبینین لێرەدا لەهەر دوو تەیبلَکە ID هەیە کەواتە دەتوانین لەڕێگەیەوە داتا بۆ چەند فیلَدێك داخل بکەین بیبەستین پێکەوە .

دواتر کلیکی لای چەپ لەسەر یەکێك لەIDدەکەین دەستی لەسەر هەلَناگرین و ئایکۆنەکە ڕادەکێشین بۆ ID کەی دیکە ڕاستەوخۆ ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە .




ئێمە تەنها گرتە لەسەر Create دەکەین ڕاستەخۆ پەیوەندیەکە درووست دەبێت.




**دواتر خەزنی دەکەین و دایدەخەین پاشان دەڕۆین تەیبڵی کۆلێجی زانست دەکەینەوە**

کۆلێجی زانست

| ID | ناوی مامۆستا | مووچە | ناونیشان | ڕەگەز |
|---|---|---|---|---|
| 1 | عەباس | $567.00 | کەلار | نێر |
| 2 | دڵشاد | $567.00 | کەلار | نێر |
| 3 | کاروان | $678.00 | کەلار | نێر |
| 4 | دریا | $868.00 | خانەقین | مێ |
| 5 | مهران | $768.00 | سلێمانی | مێ |
| 6 | ڕێباز | $678.00 | کۆیە | نێر |
| 7 | دیار | $786.00 | دەربەندیخان | نێر |
| 8 | | | | |

**کەتەیبڵەکەمان کردەوە دەبینین بۆ هەرخانەیەك هێمای (+) زیادبووە کە ئاماژەیە بۆ درووست بوونی پەیوەندیەکە .**

کاتێك كلیك لەسەر هەر (+) دەكەین دەبینین ویندۆیەكی بچووك دەكرێتەوە كە فیلْدەكانی تەیبلْەكەی دیكەیە ، دەتوانین داتای بۆ بنێرین .

كۆلێجی زانست

| ID | ناوی مامۆستا | مووچە | ناونیشان | ڕەگەز |
|---|---|---|---|---|
| 1 | عەباس | $567.00 | کەلار | نێر |
| 2 | دلشاد | $567.00 | کەلار | نێر |
| 3 | کاروان | $678.00 | کەلار | نێر |
| 4 | دریا | $868.00 | خانقین | مێ |
| 5 | مهران | $768.00 | سلێمانی | مێ |
| 6 | ڕێباز | $678.00 | کۆیە | نێر |
| 7 | دیار | $786.00 | دەربەندیخان | نێر |

| بەشە وانە | ماوەی وانە | بڕوانامە | Click to Add |
|---|---|---|---|
| 0 | 0 | | |

من توانیم لەڕێگەی فیلْدیIDپەیوەندیەك لەگەلْ تەیبلْێكی دیكەدا درووست بكەم و داتا بنێرم بۆ ناو سێ فیلْد كەواتە ئەم پەیوەندیە لەجۆری One-to-Many كە تیایدا فیلْدێك داتا دەنێرێ بۆ چەند فیلْدێكی دیكە .

دواتر تەیبلْەكەی دیكە دەكەینەوە دەبینین داتاكانی كەناردوومانە هەمووی وەرگرتووە.

زانستی كۆمپیوتەر

| ID | بەشە وانە | ماوەی وانە | بڕوانامە |
|---|---|---|---|
| 1 | 3 | 2 | ماستەر |
| 2 | 2 | 2 | ماستەر |
| 3 | 1 | 2 | ماستەر |
| 4 | 1 | 2 | ماستەر |
| 5 | 2 | 4 | ماستەر |
| 6 | 1 | 2 | ماستەر |
| 7 | 3 | 6 | ماستەر |

# Many-to-Many

جۆرێکی دیکەی Relationship کەتیایدا چەند فیلدێك لەناو تەیبڵێکدا دەبەسترێتەوە بەچەند فیلدێکی دیکە لەناو تەیبڵێکی دیکەدا زۆرجار بەم جۆرە Relationship دەوترێت Junction table چونکە لەم جۆرەدا پێویستیمان بە درووستکردنی سێ تەیبڵ هەیە .

هەمیشە دووتەیبڵی ئاسایی درووست دەکەین بەڵام تەیبڵی سێیەم هەمووئەو فیڵدانەی بۆ زیاد دەکەین کەلەناو هەردووتەیبڵەکەی دیکەدا هەیە .

گەشەپێدەر

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| گەشەپێدەرID | AutoNumber |
| ناوی یەکەم | Short Text |
| ناوی دووەم | Short Text |
| ناونیشان | Short Text |
| ڕەگەز | Short Text |
| ئیمێل | Short Text |
| پیشە | Short Text |

تەیبڵی یەکەم

پڕۆژە

| Field Name | Data Type |
|---|---|
| پڕۆژەID | AutoNumber |
| ناوی پڕۆژە | Short Text |
| گەشەپێدەر | Long Text |
| کاتی دەستپێکردن | Date/Time |
| کاتی تەواو بوون | Date/Time |
| بودجە | Currency |

تەیبڵی دووەم

دەبینین لەهەردوو تەبڵەکە ID بەکارهاتووە کەواتە تەیبڵی سێیەم لەو دوو فیڵدە درووست دەکەم کە ID بەکارهێناوە .

## تەیبڵی سێیەم

تەیبڵی هاوبەش

| Field Name | Data Type |
| --- | --- |
| گەشەپێدەرID | Number |
| پرۆژەID | Number |

دواتر دەڕۆین پەیوەندیەکە درووست دەکەین




دواترخەزنی دەکەین ودواتر دایدەخەین پاشان دەڕۆین تەیبڵەکان دەکەینەوە داتاکان بۆیەکتری دەنێرین من لێرەدا باسی داخل کردنی داتاکان ناکەم چونکە لەپەڕەکانی پێشووتردا باسم کردووە .

# Form

فۆرم بریتییه لەو شێوەیەی کەلەسەر زۆربەی داتابەیسەکاندا هەیە کە ئاسانکاریەکی زۆر دەکات بۆ خەزن کردن داتا یان بینینی داتاکان و بەڕێوەبردنییان بەشێوەیەکی زۆرباش .

**پێکهاتەیفۆرم :**

فۆرم پێکدێت لە کۆمەڵێ Label و Button کەداخلکردنی و سڕینەوەی یان بینینی داتا ئاسان و خێرادەکەنەوە .

تێبینی//بۆ دروستکردنی فۆرم پێویستە سەرتا تەیبڵمان درووست کردبێ کەواتە بنچینەی هەموو فۆرمێك تەیبڵە .

**جۆرەکانی فۆرم :**

**1**-Bound forms

**2**-Unbound forms

---

## Bound Forms

١-ئەم جۆرە فۆرمە ڕاستەوخۆ بەستراوە سەرچاوەی داتاکەوە وەکو تەیبڵ یان کویری یان کۆدەکانی SQL ەوە .

٢-پێش درووستکردنی ئەم جۆرە فۆرمە دەبێت تۆ تەیبڵت درووستکردبێ و داتاکانت داخڵکردبێ .

٣- ئەم جۆرە فۆرمە بریتیە لەکۆمەڵێ فۆرم کەبەشێوەی حازر لەناو بەرنامەکەدا هەن .

٤- ئەم ڕێگایەش دوو جۆرە Single Item Form و Multiple Item Form لەجۆری Multiple Item Form دا کۆمەڵێ فۆرمی ئامادەکراو هەیە دواتر باسی درووستکردنیان ئەکەین .

# Unbound forms

١- ڕێگایەکی دیکەی درووستکردنی فۆرمە کەتیایدا سەرچاوەی ئەوداتایەی کەهەمانە نە بەستراوەتەوە بەفۆرمەکەوە دەبێت خۆمان بیبەستێنەوە بەفۆرمەکەوە .

٢- لەم ڕێگەیەدا دەتوانین بەئارەزووی خۆمان دەستکاری ئەو فۆرمە بکەین کەهەمانە .

٣- لەم ڕێگەیە سەرەتا تەنها پێویستیمان بەدرووستکردنی تەیبڵ هەیە .

## فۆرمی ئامادەکراو

لەناو بەرنامەی ئەکسس داکۆمەڵێ شێوازی فۆرم هەیە کەبەشێوەی حازر دانراوە بۆ ئەوەی بتوانین بەکاریبینین, ئێمە لێرەدا باسی کۆمەڵێ ڕێگە بۆدرووستکردنی ئەو جۆرە فۆرمانە دەکەین .

### فۆرمی یەکەم

سەرەتا ئەو تەیبڵەی کەهەمانە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ فۆرمی لەسەر درووست بکەین




من لێرەدا تەیبڵی (پرۆژە)م دیاری کردووەتەنها بەیەك كلیك لەسەری دیاری کەکرێ

دوای ئەوەی کەتەیبڵەکەمان دیاریکرد لەبەشی سەرەوەدا گرتە لەسەر Create دەکەین .




دوای ئەوەی گرتەمان لەسەرForm کرد ڕاستەوخۆ فۆرمێك درووست دەبێت

پرۆژە

| | |
|---|---|
| پرۆژەID | (New) |
| ناوی پرۆژە | |
| گەشەپێدەر | |
| کاتی دەستپێکردن | |
| کاتی تەواو بوون | |
| بودجە | $0.00 |

گەشەپێدەرID

Record: 1 of 1 No Filter Search

بۆ پیشاندانی دانە بە دانەی داتاکان

Record: 1 of 1 No Filter Search

# فۆرمی دووەم

بەهەمان شێوەی فۆرمی یەکەم سەرەتا ئەو تەیبڵە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ فۆرمی لەسەر درووست بکەین .




دواتر گرتە لەسەر More Form دەکەین دەبینین چوار شێوە فۆرمان پیشان دەدات بۆ نموونە ئێمە Multiple Items هەڵدەبژێرین گرتەی لەسەر دەکەین .




Multiple Items

## کاتێ گرتەمان لەسەری کرد ئەم شێوە فۆرمە درووست دەبێ

پرۆژە

| IDپرۆژە | ناوی پرۆژە | گەشەپێدەر | کاتی دستپێکردن | کاتی تەواو بوون |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| (New) | | | | |

# فۆرمی سێیەم

بەهەمان شێوەی فۆرمی دووەم سەرتا تەیبڵەکە دیاری دەکەین دواتر دەچینە سەرCreate دواتر گرتە لەسەر More Form دەکەین فۆرمی شێوەی Datasheet هەڵدەبژێرین .




دەبینین فۆرمی بەشێوەی تەیبڵ درووست دەبێت من لێرە وینەکەی دانانێم خۆت دەتوانی بیبینی .

# فۆرمی سێیەم

بەهەمان شێوە سەرەتا تەیبڵەکە دیاری دەکەین دواتر دەچینە سەرCreate دواتر گرتە لەسەر More Form دەکەین فۆرمی شێوەی Split Form هەڵدەبژێرین .




دەبینین بە شێوەی فۆرم و تەیبڵ پیشانی دەدات

پرۆژە

| | |
|---|---|
| پرۆژەID | (New) |
| ناوی پرۆژە | |
| گەشەپێدەر | |
| کاتی دستپێکردن | |
| کاتی تەواو بوون | |
| بودجە | $0.00 |

| پرۆژەID | ناوی پرۆژە | گەشەپێدەر | کاتی دستپێکردن | کاتی تەواو بوون | بودجە |
|---|---|---|---|---|---|
| (New) | | | | | $0.00 |

# فۆرمی چوارەم

بەهەمان شێوە سەرەتا تەیبڵەکە دیاری دەکەین دواتر دەچینە سەرCreate دواتر گرتە لەسەر More Form دەکەین فۆرمی شێوەی Modal Dialog هەڵدەبژێرین .




دەبینین بەم شێوەیە فۆرمەکە درووست دەبێت

Form1

Detail

# Form Wizard

ڕێگەیەکی دیکەیە بۆ دروستکردنی فۆرم کەبەشێوەیەکی حازر لەناو ئەکسس دا هەیە .

سەرەتا گرتە لەسەر Create دەکەین :




دوای ئەوەی گرتە لەسەر Form Wizard دەکەین ئەم ویندۆیەی خوارەوە دەکرێتەوە




>> هەموو فیلدەکان بەیەکجار داخل دەکات بۆناو فۆرمەکە .

> دانە بە دانەی فیلدەکان داخل دەکات بۆناو فۆرمەکە.

دواتر دەبینین ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە دەبینین چوارشێوەی فۆرم پیشان دراوە بەئارەزووی خۆمان دانەیەك هەڵدەبژێرین من لێرەدا یەکەم دانەم هەڵبژاردووە .

Form Wizard

What layout would you like for your form?

Columnar
Tabular
Datasheet
Justified

Cancel | < Back | Next > | Finish

دواتر ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە

Form Wizard

What title do you want for your form?

پرۆژە

ناوی فۆرمەکە

That's all the information the wizard needs to create your form.

Do you want to open the form or modify the form's design?

Open the form to view or enter information.
Modify the form's design.

Cancel | < Back | Next > | Finish

دواتر Finsh دەکەین و ئەنجامەکەی دەبینین

پرۆژە

پرۆژەID
ناوی پرۆژە
گەتەیندر
کاتی دستپێکردن
کاتی تەواو بوون
بودجە
$0.00

بۆپیشاندانی دانەبەدانەی داتاکان

Record: 1 of 1 No Filter Search

**تێبینی // من لێرەدا باسی جۆرەکانی دیکە ناکەم خۆت دەتوانی تاقیبکەیتەوە .**

# Form Design

ڕێگەیەکی دیکەی درووستکردنی فۆرمە یەکێکە لەڕێگە باشەکان چونکە بەئارەزووی خۆمان دەتوانین دەستکاری ئەو فۆرمەبکەین کەهەمانە یان دەتوانین بەئارەزووی خۆمان بەشی بۆ زیادبکەین یان بەشی لێ کەم بکەینەوە .

سەرەتا ئەو تەیبڵە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ فۆرمی بۆدرووست بکەین دواتر گرتە لەسەر بەشی **Create** دەکەین دواتر **Form Design** :




دوای گرتەکە ئەمویندۆیە پیشاندەدات



دەبینین هەموو هەموو تەیبڵەکانی پیشان دا لەتەنیشتی هەر تەیبڵێکدا هێمای(+) هەیە هەرتەیبڵێکمان بویێت کەفۆرمی لێ درووست بکەین گرتە لە (+) دەکەین دەبینین هەموو فیڵدەکانی تەیبڵەکەمان پیشان دەدات هێماکەش دەبێتە (-) من لێرەدا تەیبڵی گەشەپێدرم دیاریکردووە .




دواتر دەبڵ کلیك لەسەر هەر فیڵدیك دەکەم دەبینم ڕاستەوخۆ دەچێتە ناو فۆرمەکەوە .



دواتر بۆ ئەوەی شێوەی فۆرمەکە ببینم دەیبەمە باری View




فۆرمەکەم لەباری View



# دەستکاری کردنی Form Design

کاتێك ئێمە فیڵدەکان زیاد دەکەین بۆ فۆرمەکەمان ڕاستەوخۆ خۆی لە شوێنێك دا جێگیر دەبێت بەڵام ئێمە دەتوانین بە ئارەزووی خۆمان دەستکاری شوێنەکەی بکەین .

سەرەتا گرتە لەسەر ئەو فیڵدە دەکەین کەمەبەستمانە دەستکاری بکەین دەبینین ڕەنگی زەرد دەبێت :

من لێرەدا گرتەم لەسەر فیڵدی پیشە کردووە دەبینین ڕەنگی زەرد بووە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەم رای دەکێشم بۆ ئەو شوێنەی کەمەبەستمە .

من لێرەدا هەمووی دەستکاری دەکەم و دەیبەمە دەستە ڕاست .

Form1

Detail

گەشتەیێدرID

ناوی یەکەم

ناوی دووەم

ناونیشان

ڕەگەز

ئیمێڵ

پیشە

دواتر دەیبەینە باری View بۆ بینینی فۆرمەکە .

Form1

گەشتەیێدرID (New)

ناوی یەکەم

ناوی دووەم

ناونیشان

ڕەگەز

ئیمێڵ

پیشە

**یان دەتوانم قەبارەی فیلْدەكان زیاد و كەم بكەین بۆلای ڕاست و چەپ یان بۆسەرە و خوارەوە بەگرتە كردن لەسەر هێڵە زەردەكانی دواتر ڕاكێشانی بە دڵی خۆت .**

**دواتر دەیبەینە باری View بۆبینینی فۆرمەكە**

# Property Sheet

تایبەتمەندیەکی دیکەیە کەلە زۆربەی ئەو DBMS دا هەیە کە بۆ درووست کردنی داتابەیس بەکاردێن کەلەڕێگەیە وە دەتوانین چەندین تایبەتمەندی و شێوەی جوان بدەین بە Button و Label ی فۆرمەکەمان .

لەبەشی سەرەوەی Design View کاتێك فۆرمەکەمان درووست دەکەین دەچێتە باری کاتێك گرتەی لەسەر دەکەین Property Sheet ویندۆیەکە بەشێك هەیە بەناوی ڕاستەوخۆ لە دەستەڕاستی شاشەکە وینۆیەکی بچووك درووست دەبێت کەپێك هاتووە لە چەند تایبەتمەندیەك .



تێبینی // ئەگەر بمانەوێ ئەم تایبەتمەندیانە بەکاربێنین دەبێ سەرەتا Button یان Label ەکە دیاری بکەین کەدەمانەوێ ئەم تایبەتمەندیانەی لەگەڵدا بەکاربێنین .

**لێرەدا ئێمە باسی هەندێك لەو تایبەتمەندیانە دەکەین :**

**Decimal Places** زیاتر لەگەڵ ئو فیڵدانەدا بەکاردێت کە ژمارەی بەکارهێناوە بۆ دیاریکردنی ژمارەی سفرەکانی دوای فاریزە.

**Visibel** بۆ دەرکەوتنی **Button** و **Label** بەکاردێ **Yes** واتە دەرکەوتن **No** بۆ شاردنەوە .

**Width** بۆ دیاری کردنی پانی بەکاردێت .

**Height** بۆ دیاریکردنی بەرزی بەکاردێت .

**Top** بۆ بردنە سەرەوەی **Button** و **Label** بەکاردێت .

Back Style بۆ دەرکەوتنی لادانی ئەو خاڵە وردانە یان لابردنی **Transparent** بۆدەرکەوتنی خاڵە وردەکان و Normal بۆ لابردنی خاڵە وردەکان .

**Back Color** بۆ دیاریکردنی ڕەنگ بەکاردێت واباشترە (...) بەکاربێنین چونکە ڕەنگەکە پیشان دەدات .

**Border Style** بۆ دیاریکردنی شێوازی دەرکەوتنی سنوری **Button** ەکە.

**Border Width** بۆ دیاریکردنی پانی هێڵی سنووری **Button** ەکە .

**Border Color** بۆ دیاریکردنی ڕەنگی سنووری **Button** ەکە .

**Special Effect** چەند شێوازێکی جوانە بۆ **Button** دەتوانی خۆت تاقیبکەیتەوە .

**Scroll bar** دەرکەوتنی سکرۆڵ بار لەسەر شاشەکە .

**Font Siz** دیاریکردنی قەبارەی نووسین جۆرەکانی دیکەی دەستکاری کردنی نووسینەکە خۆی نووسراوە بۆ چ شتێك بەکاردێت .

**On click** واتە بەیەك کلیك ئەو**Button** ئیشی خۆی بکات .

**Pop up** پیشان دانی فۆرمەکە وەکو ویندۆ ئەگەر **Yes** بکەین .

تێبینی // بەڕێگەیەکی دیکەش دەتوانین دەستکاری Button وLabel بکەین بەویستی خۆمان سەرەتا کلیکی ڕاست لەسەر ئەو Button یان ئەو Label دەکەم کەمەبەستمە دەبینم زۆرشت پیشان دەدات کەمەبەستمە بەکاری بێنم .



# بەشەکانی فۆرم

بەشێوەیەکی گشتی فۆرم لەسێ بەش پێکدێت :

١- Header بەشی سەرەوەی فۆرمەکە .

٢-Detail بەشی ناوەڕاستی فۆرمەکە .

٣-Footer بەشی خوارەوە فۆرمەکە .

ئەگەر بەشی Header وFooter بەدیار نەکەوتبوو ئەوا لەبەشی سەرەوە گرتە لەسەرTitle دەکەین یان کلیکی ڕاست دەکەین گرتە لەسەر Form Header/Footer دەکەین .




دەتوانین ماوەی Header و Footer کەم و زیادبکەین سەرەتا دەچینە سەرBorderی هێدەر یان فووتەر دەبینین هێمای ┼ بەدیار دەکەوێ دواتر بۆ خوارەوە یان بۆ سەرەوە ئایکۆنەکە دەبەین .




ماوسەکە دەبەمە سەری تاوەکو هێمای ┼ بەدیار دەکەوێ دواتر بەرەوە خوارەوە ڕایدەکێشمە بۆ Footer و Detail هەمان شێوە بەڵام فووتەر بۆسەرەوە .

بەهەمان شێوە دەتوانین چەندین کاری دیکە ئەنجام بدەین وەکو ڕەنگ کردن یان دووئەوەندە کردن یان لابردنی خاڵە وردەکان سەرەتا ئەوە **Header** یان **Footer** یان **Detial** دیاری دەکەین دواتر کلیکی ڕاست دەکەین دەبینین چەندین تایبەتمەندی پیشان دەدات.




**Fill/Back Color** دیاریکردنی ڕەنگ .

**Ruler** بۆ لابردنی ژمارەکانی سەرەوە (. . . . . . .١. . . . . . .٢. . . . .) .

**Grid** بۆلادانی خاڵە وردە ڕەشەکان .

**Page Header/Footer** دوو ئەوەندە کردنی هێدەر و فووتەر .

**Form Properties** پیشاندانی کۆمەڵێ تایبەتمەدنی پێشترلە **Property Sheet** دا باسمان کرد .

تێبینی // من لێرەدا تاقیناکەمەوە خۆت دەتوانی تاقیبکەیتەوە .

بەهەمان شێوە دەتوانین نوسین لە شوێنی **Header** دا بنووسن سەرەتا لەبەشی سەرەوە کلیك لەسەر **Titel** دەکەین

**دواتر لەباری View**

# پیشاندانی فۆرمەکەمان وەکو ویندۆیەك

لێرەدا باسی ئەوە دەکەین کە چۆن فۆرمەکەمان بەشێوەی ویندۆیەکی سەربەخۆ پیشان بدەین .

سەرەتا دەچینە سەر **Property Sheet** دواتر لەبەشی **Selection Type** دا **Form** هەڵدەبژێرین دواتر **Other** دواتر **Pop up** دەکەین بە **Yes**.




## دواتر لەبەشی Other دا Pop up دەکەین بە Yes



دواتر گرتە لەسەر View دەکەین بۆ بینینی ئەنجامی کارەکە

Form1

IDگەشتیار (New)

ناوی یەکەم

ناوی دووەم

ناونیشان

ڕەگەز

ئیمێڵ

پیشە

Record: 1 of 1 No Filter Search

دەبینین فۆرمەکەمان بوو بەشێوەی ویندۆیەکی سەربەخۆ بەڵام دەبینین لەخوارەوە Navigation Button هەیە و لەلای چەپیش Record Selectors هەیە ئێمە چۆن بتوانین لای بدەین بۆ ئەوەی ویندۆیەکەمان جوانتر بێت لەپەڕەکەی تردا باسی دەکەین.

به هەمان شێوەی کاری پێشوو بەڵام بەشی **Format** دواتر **Record Selectors** و **Navigation Button** دەکەین بە **No** .

سەرەتا

Form

Format | Data | Event | Other | All

| | |
|---|---|
| Caption | |
| Default View | Single Form |
| Allow Form View | Yes |
| Allow Datasheet View | Yes |
| Allow Layout View | Yes |
| Picture Type | Embedded |
| Picture | (none) |
| Picture Tiling | No |
| Picture Alignment | Center |
| Picture Size Mode | Clip |
| Width | 0" |
| Auto Center | No |
| Auto Resize | Yes |
| Fit to Screen | Yes |
| Border Style | Sizable |
| Record Selectors | No |
| Navigation Buttons | No |
| Navigation Caption | |
| Dividing Lines | No |
| Scroll Bars | Both |
| Control Box | Yes |
| Close Button | Yes |
| Min Max Buttons | Both Enabled |

دەتوانی خۆت تاقیبکەیتەوە و ئەنجامەکەی ببینی

# دانانی وێنە لە فۆرم دا

ئێمە دەتوانین وێنە دابنێین بۆ ئەو فۆرمەی کە کەهەمانە بۆ ئەوەی ڕوکارێکی جوان بدات بە فۆرمەکەمان واباشترە ئەو وێنەیەمان بە بەرنامەی فۆتۆشۆپ درووستی بکەین چونکە جوانترە .

سەرەتا کەفۆرمەکەمان درووست دەکەین لەبەشی سەرەوەدا گرتەلەسەر **Insert Image** دەکەیندواتر گرتە لەسەر **Browser** دەکەین وێنەیەك هەڵدەبژێرین .




کە وێنەکە هەڵدەبژێرین ڕاستەوخۆ هێمای ☐✚ دەچێتە سەر فۆرمەکە بۆ دیاریکردنی شوێنی وێنەکە .



که ئەم وێنەیە پیشان دەدات گرتە لەشوێنێکی وێنەکە دەکەین و ڕایدەکێشین بۆ شوێنەکەی دیکە ڕاستەوخۆ وێنەکە لەسەر فۆرمەکە درووست دەبێت .



دەبینین وێنەکە هەموو فۆرمەکەی نەگرتووەتەوە بۆیە گرتە لەسەر Property Sheet دەکەین دواتر لەبەشی Form دواتربەشی Size Mode دەکەین بە Stretch .




دواتر دەبینین فۆرمەکە بەشێوەی پڕاوپڕ پیشان دەدات



ئەم ڕێگەیەی من باسم کرد دەبێت سەرەتاوێنەکە دابنێین دواتر فیڵدەکان داخلی فۆرمەکە بکەین وەهەروەها دەتوانین سەرەتا فیڵدەکان داخل بکەین دواتر وینەی بۆ دابنێین بەڵام ئەم جارە لەڕێگەی **Background Image** سەرەتا لەسەرەوە گرتە لەسەر **Format** دەکەین دواتر **Background Image** هەڵدەبژێرین دواتر **Browser** دەکەین وێنەیەك هەڵدەبژێرین .




**خۆت دەتوانین ئەنجامەکەی ببینیت**

# پیشاندانی داتاکانی ناو فۆرم

ئێمە دەتوانین لەڕێگەی Navigation Button دانە بەدانەی داتاکانی پیشان بدەین لەپەڕەکانی پێشووتردا من باسی Navigation Button کرد بەڵام لێرەدا تەنها دەیکەین بە Yes .

Form

Format | Data | Event | Other | All

| | |
|---|---|
| Caption | |
| Default View | Single Form |
| Allow Form View | Yes |
| Allow Datasheet View | Yes |
| Allow Layout View | Yes |
| Picture Type | Shared |
| Picture | Chrysanthemu |
| Picture Tiling | No |
| Picture Alignment | Center |
| Picture Size Mode | Clip |
| Width | 6.1694" |
| Auto Center | No |
| Auto Resize | Yes |
| Fit to Screen | Yes |
| Border Style | Sizable |
| Record Selectors | Yes |
| Navigation Buttons | Yes |
| Navigation Caption | |
| Dividing Lines | No |
| Scroll Bars | Both |
| Control Box | Yes |
| Close Button | Yes |

دەیکەین بە Yes

دواتر دەیبەینە باری View بۆ بینینی ئەنجامەکەی

# زیادکـردنـی Button بۆ فـۆرم

ئەو فۆرمەی کەلەبەردەستمان دایە دەتوانین Button بۆ زیادبکەین ئامانج لەم زیادکردنە ئەنجامدانی ئیشی زیاترە لەسەر فۆرمەکە .

سەرەتا فۆرمەکە درووست دەکەین دواتر لەبەشی سەرەوەی شاشەکە گرتە لەسەر وێنەی XXX دەکەین دەبینین ئایکۆنی ✚ درووست دەبێت بەهۆیەوە دەتوانین شوێنی Button دیاری بکەین .




دواتر ئایکۆنەکە دەبێتە ✚ کەبەهۆیەوە شوێنی Button دیاری دەکەین .

**كاتێك شوێنى Button ديارى دەكەين ڕاستەوخۆ ئەم ويندۆيە دەكرێتەوە**




**دەبينين ويندۆيەكە دوو بەشى تێدايە Categories لەگەڵ Action كەئيشى Button ديارى دەكات هەر ئيشێك ديارى دەكەين وێنەى ئيشەكە پيشان دەدات لەسەرەوە .**

## Record Navigation

١- Find Next بۆ دۆزینەوەی ئیشی دواتر بەکاردێت .

٢- Find بۆ دۆزینەوەی هەرشتێك کە بتەوێ بەکاردێت .

٣- Go To First Record بۆ چوونەسەر خانەی یەکەم .

٤- Go To Last Record بۆ چوونەسەر خانەی کۆتایی .

٥- Go To Next Record بۆ چوونەسەر خانەی دواتر .

٦- Go To Previous Record بۆ گەڕانەوە بۆ خانەی پێشتر .

## Record Operation

٢- Add New Record بۆ خەزنکردنی خانەیەك .

٣- Delete Record بۆ سڕینەوەی خانەیەك .

٤- Duplicate Record بۆ دووئەوەندەکردنی خانە .

٥- Print Record چاپکردنی خانە .

٦- Save Record خەزنکردنی خانە .

٧- Undo Record پاشگەز بوونەوە لەخەزنکردنی خانە .

## Application

١- Quit Application داخستنی بەرنامەکەمان .

تێبینی // من لێرەدا ناتوانم باسی هەموو بکەم خۆت دەتوانی بڕویتە سەر بەشەکان و ئیشەکە هەڵبژێریت .

که ئیشەکەمان هەڵبژارد دواتر **Next** دەکەین ئەم ویندۆیەی خوارەوە پیشان دەدات




دەبینین دوو **Radio Box** پیشان داوە( **Picture** و **Text** ) لێرەدا مەبەستی ئەوەیە ئەو **Button** درووستمان کردووە بەشێوەی وێنە پیشانی بدات یان شت بنووسین لەسەر ئەگەر ویستمان بەنووسین بێت **Text** پڕدەکەین و لەناو لاکێشەکەدا ناوی **Button** دەنووسین دواتر **Next** دەکەین دواتر **Finish** دەکەین.



# کرداری زیادکردن و سڕینەوە




دواتر بەهێمای + شوێنی دانانی **Button** دیاری دەکەین ڕاستەوخۆ ئەم ویندۆیە دەرێتەوە






کەناوەمان نا دواتر Next دەکەین دواتر Finish دەکەین دەبێتین دەبینین درووست بووە بۆ سڕینەوەش بەم شێوەیە :




**دواتر Next دەکـەین**




**دواتر Next دواتر Finish دەکەین دەبینین درووست بووە**




**دواتر دیبەینە باری View**

## فۆرمەکەمان لەباری View

Form1

گەشەپێدەر ID (New)

ناوی یەکەم

ناوی دووەم

ناونیشان

ڕەگەز

زیادکردن

سڕینەوە

# درووستکردنی Search Engine

Search Engine بەکاردێت بۆ ئەنجام دانی کرداری گەڕان لەناو داتابەیس دا بەئامانجی دۆزینەوە شتێك لەناو داتابەیسەکەدا .

تێبینی // تەنها لەبەشیForm Wizard دا دەتوانین ئەم Search Engine درووست بکەین .

سەرەتا فۆرمێك درووست دەکەین لەبەشی Form Wizard دا پێشتر باسم کردووە چۆن درووست دەکرێت کەفۆرمەکەمان درووست کرد دەیبەینە باری Design View :



دواتر دەبینین هێمای درووست دەبێت کەبەهۆیەوە شوێنەکەی دیاری دەکەین .

## کاتێك شوێنەکەی دیاری دەکەین ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە

Combo Box Wizard

This wizard creates a combo box, which displays a list of values you can choose from. How do you want your combo box to get its values?

I want the combo box to get the values from another table or query.

I will type in the values that I want.

Find a record on my form based on the value I selected in my combo box.

ئەمە هەڵدەبژێرین

دواتر

Cancel | < Back | Next > | Finish

کاتێك Next دەکەین ئەم ویندۆیە پیشان دەدات داوامان لێدەکات فیڵدێك هەڵبژێرین کەبەپێی ئەوفیڵدە گەڕان بکات

Combo Box Wizard

Which fields of بەشی فرۆشتن contain the values you want included in your combo box? The fields you select become columns in your combo box.

Available Fields:

ناوی خواردن
دانە
نرخ
ڕۆژی دەرچوون
ڕۆژی بەسەرچوون

Selected Fields:

ID خواردن

> | >> | < | <<

دواتر

Cancel | < Back | Next > | Finish

من لێرەدا ( خواردن ID ) هەڵبژاردووە دەمەوێ بەپێی ئەوە گەڕانم بۆ بکات


Combo Box Wizard
How wide would you like the columns in your combo box?
To adjust the width of a column, drag its right edge to the width you want, or double-click the right edge of the column heading to get the best fit.
ID خواردن
دواتر
Cancel
< Back
Next >
Finish


Combo Box Wizard
What label would you like for your combo box?
گەرانا
ناوی دەنێین
Those are all the answers the wizard needs to create your combo box.
Cancel
< Back
Next >
Finish

دەبینین درووست بووە

| | |
|---|---|
| خواردن ID | خواردن ID |
| ناوی خواردن | ناوی خواردن |
| دانە | دانە |
| نرخ | نرخ |
| رۆژی دەرچوون | رۆژی دەرچوون |
| رۆژی بەسەرچوون | رۆژی بەسەرچوون |
| گەڕان | Unbound |

دواتر من ڕێکی دەخەم و چەند بەشێکی بۆ زیاددەکەم

## بەشی فرۆشتن

| | |
|---|---|
| خواردن ID | (New) |
| ناوی خواردن | |
| دانە | 0 |
| نرخ | $0.00 |
| رۆژی دەرچوون | |
| رۆژی بەسەرچوون | |

زیادکردن سڕینەوە گەڕان

ژمارەیIDدەنووسم دواترEnter

# تیکەڵکردنی فۆرم

دەتوانین چەند فۆرمێك بەیەکەوە ببەستین پێکەوە لەرێگەی **Navigation Form** وە بۆ خێراکردنی ئەو کارانەی کەهەمانە.

سەرەتا گرتە لەسەر **Navigation Form** دەکەین دەبینین چەند جۆرێك فۆرمان پیشان دەدات ئێمە یەکەم دانە هەڵدەبژێرین



دەبینین فۆرمەکە بەم شێوەیە پیشان دەدات

Navigation Form

[Add New]

دواتر کلیکی لای چەپ لەسەر دانە بەدانەی فۆرمەکان دەکەین و رای دەکێشین بۆسەر[Add New]

Navigation Form

بەشی فرۆشتن | Form3 | Form2 | Form1 | [Add New]

بەشی فرۆشتن

خواردن ID 1

ناوی خواردن جصیقفغ

دانە 2

نرخ $22.00

رۆژی دەرچوون 08-Jul-17

رۆژی بەسەرچوون 13-Jul-17

زیادکردن سرینەوە گەران

دەبینین هەموو فۆرمەکانی لەسەرەوە پیشان داوە بەڵام ئێمە ناتوانین ئێستا داخل بکەین دەبێت سەرەتا خەزنی بکەین دواتر دایدەخەین پاشان دەیکەینەوە ئێستا دەتوانین داتا داخل بکەین .

تێبینی // دەتوانین بەشێوەی دیکە فۆرمەکان پێکەوە ببەستینەوە ، لەبەشی **Navigation Form** دا گرتە لەسەر شێوەی دووەم دەکەین دەبینین بەم شێوە پیشانی دەدات .







سەرەتا خەزنی بکەین دواتر دایدەخەین پاشان دەیکەینەوە ئێستا دەتوانین داتا داخل بکەین .

# پێکەوەبەستنی فۆرم

ئەگەر ئێمە چەند فۆرمێکمان هەبێت چۆن هەموویان پێکەوە ببەستین بۆنموونە ئەگەر فۆرمی زانستی کۆمپیوتەرم هەبێت لەگەڵ فۆرمی زانستی کیمیا کاتێك بەوێت کەگرتەم لەسەر بەتنی زانستی کۆمپیوتەر کرد ڕاستەوخۆ بکرێتەوە .

سەرەتا فۆرمێك درووست دەکەم هەردوو بەتنی کۆمپیوتەر و کیمیای تێدایە :




دواتر شوێنەکانی دیاری دەکەین و ناوی دەنێین



سەرەتا گرتە لەسەر بەتنێك دەكەین بۆ نموونە بەتنی زانستی كۆمپیوتەر دواتر لەسەرەوە گرتە لەسەر Property Sheet دەكەین دواتر لەبەشی Event دا گرتە لەسەر On Click دەكەین




دەكەین ڕاستەوخۆ ئەم ویندۆیە دەكرێتەوە On Clickكە گرتە لەسەر



دەبینین ئەم ویندۆیە دەكرێتەوە گرتە لەسەر **Combo Box** دەكەین و **Open Form** هەڵدەبژێرین




دواتر **Enter** دەكەین دەبینین بەشێك زیاد دەبێت ، لە **Form Name** دا ئەو فۆرمە هەڵدەبژێرین كەدەمانەوێ كاتێك گرتەمان لەسەر بەتنەكە كرد بیكاتەوە .




دواتر لە **Combo Box** دیكەدا **CloseWindow** هەڵدەبژێرم




دواتر کە **Enter** دەکەین دەبینین چەند بەشێك زیاد دەبێت لەبەشی**Object Type** فۆرم هەڵدەبژێرین وە لەبەشی **Object Name** دا ناوی ئەو فۆرمە هەلدەبژێرین کەدەمانەوێ دایبخات و بچێتە فۆرمێکی دیکە لێرەدا من فۆرمی کۆلێجی زانست هەڵدەبژێرم.

CloseWindow

| | |
|---|---|
| Object Type | Form |
| Object Name | کۆلێجی زانست |
| Save | Prompt |

دواتر خەزنی دەکەین و دواتریش دایدەخەین

## دواتر دەڕۆین فۆرمی کۆلێجی زانست دەکەینەوە




دواتر دەبینین فۆمی زانستی کۆمپیوتەر دەکرێتەوە

زانستی کۆمپیوتەر

زانستی کۆمپیوتەر

ID (New)

ناوی خوێندکار

باری خێزان

شوێنی مانەوە

شوێنی نیشتەجێبوون

ڕەگەز

زیادکردن سڕینەوە گەڕان

دوای ئەوەی کە فۆرمی زانستی کۆمپیوتەر کرایەوە دەبێت بەتنی گەڕانەوە بۆ فۆرمی کولێجی زانست درووست بکەین لەناو فۆرمی زانستی کۆمپیوتەر .

بەگرتەکردن دیاریدەکرێت

بەهەمان کاری پێشوو دەچینە سەر **On Click** کە ویندۆ بچوکەکە کرایەوە یەکەم دانە هەڵدەبژێرین دواتر ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە




لیرەدا دەنووسین **OpenForm** دواتر **Enter** دەکەین

کاتێك Enter دەکەین ئەم ویندۆیە پیشان دەدات

واتە کاتێك گرتەم لەسەر بەتنەکە کرد فۆرمی کۆلێجی زانست بکاتەوە

| | |
|---|---|
| OpenForm | |
| Form Name | کۆلیجی زانست |
| View | Form |
| Filter Name | |
| Where Condition | = |
| Data Mode | |
| Window Mode | Normal |

Update Parameters

Form هەڵدەبژێرین

دواتر

| | |
|---|---|
| OpenForm | |
| Form Name | کۆلیجی زانست |
| View | Form |
| Filter Name | |
| Where Condition | |
| Data Mode | |
| Window Mode | Normal |
| RunMenuCommand | |
| Command | CloseDatabase |
| Add New Action | |

CloseWindow

لێرەدا دەنووسین CloseWindow دواتر Enter دەکەین چەند بەشێکی دیکە پیشان دەدات

OpenForm
Form Name
View Form
Filter Name
Where Condition
Data Mode
Window Mode Normal
CloseWindow
Object Type Form
Object Name زانستی کۆمپیوتەر
Save Prompt

ئەو فۆرمە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ دایبخات

دواتر خەزنی دەکەین پاشان دایدەخەین دواتر فۆرمی کۆلێجی زانست دەکەینەوە دواتر فۆرمی زانستی کۆمپیوتەر کاتێك گرتە لەسەر بەتنی گەڕانەوە دەکەین دەبینین ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە فۆرمی کۆلێجی زانست واتە ئیشەکەمان یۆ ئەنجام دەدات .

زانستی کۆمپیوتەر

زانستی کۆمپیوتەر
ID (New)
ناوی خوێندکار
باری خێزان
شوێنی مانەوە
وێنی نیشتەجێبوون
ڕەگەز
زیادکردن سڕینەوە گەڕان
گەڕانەوە

# داخستنی داتابەیس

چۆن وابکەین ئەو داتابەیسەی کەهەمانە بەگرتەکردنێك ڕاستەوخۆ دابخرێت ، سەرەتا بەتنێك درووست دەکەین لەناو فۆرمی کۆلێجی زانست دا .

سەرەتا بەتنی داخستنی داتابەیس دیاری دەکەین دواتر بەهەمان کارەکانی پێشوو دەچینە سەر On Click دواتر ە ویندۆ بچووکەکە کرایەوە یەکەم دانە هەڵدەبژێرین .



## دواتر ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە




دواتر خەزنی دەکەین پاشان Close دەکەین دواتر کاتێك گرتە لەسەر بەتنی داخستنی داتابەیس دەکەین ڕاستەوخۆ دادەخرێت .

کۆلێجی زانست

زانستی کۆمپیوتەر

زانستی کیمیا

داخستنی داتابەیس

کاتێك گرتە دەکەین دادەخرێت

# گەورەکردنی ڕووکاری فۆرم

کاتێك فایلی داتابەیسەکەدەکەینەوە ڕاستەوخۆ تەنهاڕوکاری بەرنامەی ئەکسس دەکرێتەوە بەڵام ئەگەر بمانەوێ ڕاستەوخۆ فایلی داتابەیسەکە بکاتەوەئەم کردارانەی خوارەوە ئەنجام دەدەین .

سەرەتا فۆرمەکەمان دەبەینەباری **Design View** بۆنموونە فۆرمی کۆلێجی زانست دواتر بەشی **Property Sheet** دواتر بەشی **Event** دواتر گرتە لەسەر **OnCurrent** دەبینین ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە :




لەناو لاکێشەکەدا دەنوسین**MaximizeWindow** دواتر




دواتر خەزنی دەکەین دواتر **Close** دەکەین بەهەمان شێوە لەبەشی **Design View** خەزنی دەکەین .

لێرەدا ئەم کردارە بەس نیە ئەم کردارەی کردمان رووکاری بەرنامەکە هەردەمێنێت دواتر دەچینەسەر بەشی دیزاینی فۆرمەکە دواتر **property Sheet** دواتر لەبەشی **Event** دا گرتە لەسەر**On Load** دەکەین دواتر **Code Builder** ڕاستەوخۆ ڤیژوەڵ بەیسك دەکرێتەوە ئەم کۆدە دەنووسین **Docmd.ShowToolbar “Ribbon” , acToolNo** تکایە تەنها بەشێوەیە بینووسە .




**دواتر Code Builder هەڵدەبژێرین**



دواتر کۆدەکە دەنووسین




دواتر ویندۆیەکە دادەخەین

لێرەدا ئەم کردارە بەس نیە چونکە ڕووکاری بەرنامەکە هەردەمێنێت، دواتر دەچینەسەر Fileدواتر لەخوارەوە دەچینەسەر Option دواتر Current Database هەڵدەبژێرین ئەم ویندۆیەی خوارەوە دەکرێتەوە :



**ئەم کردارانەی خوارەوە ئەنجام دەدەین :**

**١-Display Form فۆرمی سەرەکی هەڵدەبژێرین .**

**٢-Display Status Bar هێمای ڕاستەکەی لادەبەین .**

**٣- Display Navigation Pan هێما ڕاستەکە لادەبەین .**

**٤- Allow Full Menu هێما ڕاستەکە لادەبەین .**

**٥- Allow Default Shortcut menus هێما ڕاستەکە لادەبەین .**

**دواتر Ok دەکەین نامەیەکیش پیشان دەدات ئەویش Ok دەکەین .**




**تێبینی // کرداری کۆتایی تەنها لەسەر فۆرمی سەرەکی ئەنجام دەدرێت بۆ فۆرمەکانی دیکە دەبێت دوو کردارەکەی پێشتر ئەنجام بدەین .**

دواتر فۆرمەکەو بەرنامەی ئەکسس دادەخەین دووبارە فایلی داتابەیسەکە دەکەینەوە دەبینین بەشێوەی فوول شاشە پیشانی دەدات .



# درووستکردنی فۆرمی فرۆشتن

لێرەدا باس لەوە دەکەین کەچۆن بتوانین فۆرم بۆ بەشی فرۆشتن درووست بکەین .

سەرەتا تەیبڵی فرۆشتن درووست دەکەین دواتر دەچینەسەر بەشی **More Form** چەندین شێوەی فۆرم پیشان دەدات ئێمەیەکەم دانە هەڵدەبژێرین




### دەبینین بەم شێوەیە پیشانی دەدات

بەشی فرۆشتن

| بارکۆد | ناوی دەرمان | نرخ | دانە | نرخی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| 0 | | | | |

فۆرمەکە دەبەینە باری Design View دواتر هەندێك بۆلای ڕاست دەبیین بۆ ئەوەی شوێن بۆ بەتنی سڕینەوە و خەزنکردن دیاری بکەین .

Form Header

بەشی فرۆشتن

| نرخی گشتی | دانە | نرخ | ناوی دەرمان | بارکۆد |
|---|---|---|---|---|

Detail

| نرخی گشتی | دانە | نرخ | ناوی دەرمان | بارکۆد | خەزنکردن |
|---|---|---|---|---|---|

Form Footer

**خەزنی دەکەین و دەیبەینە باری View**

بەشی فرۆشتن

| نرخی گشتی | دانە | نرخ | ناوی دەرمان | بارکۆد | |
|---|---|---|---|---|---|
| $6,00 | 2 | $3,00 | asdf | 1 | خەزنکردن |
| $12,00 | 3 | $4,00 | asdfgh | 2 | خەزنکردن |
| | 0 | $0,00 | | 0 | خەزنکردن |

لەکاتی داخل کردنی هەرداتایەك بۆناو فیلّدەکان بەشێوەی ئۆتۆماتیکی ڕیزێك درووست دەبێت .

ئەگەر بمانەوێ وەسڵێك بۆ كڕیارێك درووست بكەین بۆ ئەوەی بزانین حسابەكەی چەند دەكات دەبێت هەموو فیلْدی ( كۆی گشتی ) كۆبكەمەوە بەم شێوەی خوارەوە

سەرەتا فۆرمەكەم دەبەمەوە باری **Design View :**

دواتر لەبەشی دیزاین **Text Box** درووست دەكەین بۆ فۆرمەكە

دواتر بەهۆی هێمای + شوێنەکەی دیاری دەکەین لەناو فۆرمەکە بەم شێوەی خوارەوە دواترناوێك لە Text Box دەنێین

بەم شێوەیە Label دیاری دەکەین دواتر گرتە لەسەر Property Sheet دەکەین دواتر گرتە لەسەر Data دەکەین دواتر گرتەلەسەر Control Source دەکەین

## کە گرتە لەسەر Control Source دەکەین ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە




## دواتر Ok دەکـەین

**بەشی فرۆشتن**

| بارکۆد | ناوی دەرمان | نرخ | دانە | نرخی گشتی | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | asdf | $3.00 | 2 | $6.00 | خەزنکردن | |
| 2 | asdfgh | $4.00 | 3 | $12.00 | خەزنکردن | |
| 0 | | $0.00 | 0 | | خەزنکردن | |

کۆی گشتی: 18

**دەبێت سـەرەتا داتاکـە خـەزن بکـەین بۆ ئەوەی کـۆی گـشـتـی پیشـان بدات**

# دانانی بەروار و کات لەسەر فۆرم

سەرەتا فۆرمەکە دەبەینە باری Design View دواتر لە بەشی دیزاین دا گرتە لەسەر Date and Time دەکەین

دوای ئەمە پیشان دەدات شێوازێك هەڵدەبژێرین

## دەبینین بەروار و کاتەکە لەسەرەوە پیشان دەدات

بەشی فرۆشتن

بەشی فرۆشتن

05-Jul-17

6:51 PM

| | | بارکۆد | ناوی دەرمان | نرخ | دانە | نرخی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | خەزنکردن | 1 | tabel | $3.00 | 3 | $9.00 |
| | خەزنکردن | 2 | drink | $4.00 | 1 | $4.00 |
| | خەزنکردن | 4 | kapsol | $3.00 | 2 | $6.00 |
| | خەزنکردن | 0 | | $0.00 | 0 | |

کۆی گشتی 19

تێبینی // لەهەموو جۆرەکانی فۆرم دا دەتوانین جۆری فۆنت و قەبارەی فۆنت دیاری بکەین بەدیاری کردنی یەك فیلْد یان چەند فیلْدێك بەیەکەوە بەیارماتی ماوسەکە .

# Report

ڕاپۆرت بابەتێکی دیکەی بەرنامەی ئەکسس کەبەکاردێت بۆ پیشان دانی داتای ناو خشتەکەمان یان کویریەکەمان بەشێوەی ڕاپۆرت و پوختەکردنی داتاکە .

تێبینی // بۆ ئەوەی بتوانین ڕاپۆرت درووست بکەین پێویستە پێشوەخت خشتە یان کویریمان هەبێت .

## درووستکردنی ڕاپۆرت

**سێ ڕێگەمان هەیە بۆ درووستکردنی ڕاپۆرت :**

**Create Report -١**

**Report Wizard -٢**

**Report Design -٣**

تێبینی // درووستکردنی ڕاپۆرت زۆر نزیکە لەدرووستکردنی فۆرم ئەگەر تۆ لەچۆنییەتی درووستکردنی ڕاپۆرت تێگەشتبی ئەوا دەتوانی زۆر بەباشی ڕاپۆرت درووستبکەیت .

# Create Report

ڕێگەیەکی دروووست کردنی ڕاپۆرتە کەبەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن بەرنامەکەوە دروووست دەکرێت واتە تەنها بەیەك گرتە ڕاستەوخۆ ئەکسس بۆمان دروووست دەکات .

سەرەتا ئەو خشتەیە دیاری دەکەین کەدەمانەوێ ڕاپۆرتی بۆ دروووست بکەین :




دەبینین بەم شێوەیە ڕاپۆرتەکە دروووست دەبێت کەلەباری **Design View** دایە دەتوانین بەدڵی خۆمان دەستکاری بکەین دواتر بیبەینە باری **View** هەروەکو فۆرم خۆت تاقیبکەوە

بەشی فرۆشتن

Wednesday, July 05, 2017

6:44:14 PM

| باركۆد | ناوی دەرمان | نرخ | دانە | نرخی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| 1 | tabel | $3.00 | 3 | $9.00 |
| 2 | drink | $4.00 | 1 | $4.00 |
| 4 | kapsol | $3.00 | 2 | $6.00 |

# Report Wizard

ڕێگەیەکی دیکەیە کە بۆ درووستکردنی ڕاپۆرت بەکاردێت سەرەتا لەسەرەوە دەچینەسەر Create دواتر گرتە لەسەر Report Wizard دەکەین




کەگرتەمان کرد ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە




>> داخلکردنی فیلدەکان بۆ درووستکردنی ڕاپۆرت

تەنها Next دەکەین

Report Wizard

Do you want to add any grouping levels?

بارکۆد
ناوی دەرمان
نرخ
دانە
نرخی گشتی

Priority

بارکۆد, ناوی دەرمان, نرخ, دانە, نرخی گشتی

Grouping Options ... | Cancel | < Back | Next > | Finish

دواتر ئەم ویندۆیە دەکرێتەوە دەڵێت بەپێی چ فیلڵدێك ڕیزی دەکەیت

Report Wizard

What sort order do you want for your records?

You can sort records by up to four fields, in either ascending or descending order.

1 بارکۆد Ascending
2 Ascending
3 Ascending
4 Ascending

Cancel | < Back | Next > | Finish

من دەمەوێ بەپێی فیلڵدی (بارکۆد) ڕیزی بکەم

## دواترئەم وێنەیە دەکرێتەوەپێمان دەڵێت بەچ شێوازێك دەرکەوێ

Report Wizard

شێوەی ڕاپۆرتەکە

بەشێوەی ئاسۆی یان ستونی

How would you like to lay out your report?

Layout
Columnar
Tabular
Justified

Orientation
Portrait
Landscape

Adjust the field width so all fields fit on a page.

Cancel | < Back | Next > | Finish

Report Wizard

What title do you want for your report?

بەشی فرۆشتن

That's all the information the wizard needs to create your report.

Do you want to preview the report or modify the report's design?

Preview the report.
Modify the report's design.

Cancel | < Back | Next > | Finish

## دەبینین بەم شێوەی ڕاپۆرتەکەمان پیشان دەدات

بەشی فرۆشتن

| ناوی دەرمان بارکۆد | نرخ | دانە | نرخی گشتی |
|---|---|---|---|
| 1 tabel | $3.00 | 3 | $9.00 |
| 2 drink | $4.00 | 1 | $4.00 |
| 4 kapsol | $3.00 | 2 | $6.00 |

**تێبینی // هەموو کات دەتوانین ڕاپۆرتەکەمان ببەینە باری Design View دەستکاری ڕاپۆرتەکەمان بکەین ئەویش بەکلیکی لای ڕاست لەسەر ڕاپۆرتەکە لەسەرەوە دواتر Design View هەڵدەبژێرین .**



# Report Design

ڕێگەیەکی دیکەی درووستکردنی ڕاپۆرتە کەبەدڵی خۆمان دەتوانین دیزاینی بکەین سەرەتا دەڕۆینە سەر  **Creat** دواتر گرتە لەسەر **Report Design** دەکەین :




**دەبینین ڕاپۆرتەکەمان بەم شێوەیە پیشان دەدات**



دواتر لەبەشی سەرەوەدا گرتە لەسەر **Add Existing Field** دەکەین دواتر دەبینین بەشێك زیاد دەبێت ئێمە گرتە **Tabel** دەکەین هەموو تەیبڵەکان پیشان دەدات لەتەنیشتی هەر تەیبڵێکدد هێمای + هەیە گرتەی لەسەر دەکەین دەبینین هەموو فیلّدەکان ئەو تەیبڵە پیشان دەدات دواتر بەماوسەکە ڕای دەکێشین بۆ سەر ڕووکاری ڕاپۆرتەکە .




**دانەبەدانەی فیلّدەکان ڕادەکێشینەسەر فۆرمەکە**

بەم شێوەیە ڕووکاری ڕاپۆرتەکە وای لێدەکەین

Report Header
فۆرمی فرۆشتن
Page Header
Detail
بارکۆد بارکۆد
ناوی دەرمان ناوی دەرمان
نرخ نرخ
دانە دانە
نرخی گشتی نرخی گشتی

دواتر لەباری Report View بەم شێوەیە پیشانی دەدات

Report1
فۆرمی فرۆشتن

| | |
|---|---|
| بارکۆد | 1 |
| ناوی دەرمان | tabel |
| نرخ | $3.00 |
| دانە | 3 |
| نرخی گشتی | $9.00 |

Record Selector

بۆ پیشاندانی هەموو داتاکان Record Selector بێنە خوارەوە

# دانانی ژمارە لەسەر Report

سەرەتا Report دەبەینە باری DesignView دواتر لەبەشی سەرەوەدا گرتە لەسەر Design دەکەین دواتر گرتە لەسەر  Page Number دەکەین .




دواتر ئەو ویندۆ بچووکە دەکرێتەوە




خۆت تاقیبکەرەوە

# هەندێك بەشی گرنگ لە Report دا

لە Report دا بەشێکمان هەیە کەتەنها لە Report دا هەیە ئەوەیش Page Setup کەکۆمەڵێ تایبەتمەندی لەخۆ دەگرێت .




Size بۆ دیاریکردنی قەبارەی پەڕەکانی ڕاپۆرتەکەیە .

Margins شێوەی دەرکەوتنی ڕاپۆرت دیاریدەکات لەڕووی ئاراستەوە .

Print Dta Only تەنها داتاکانی ناو ڕاپۆرتەکە پیشان بدات .

Portrait دەرکەوتنی ڕاپۆرتەکە بەباری ستوونی .

Landscape دەرکەوتنی ڕاپۆرتەکە بەباری ئاسۆی .

Page Setup چاپکردنی ڕاپۆرت .

خۆت تاقیبکەرەوە

# Compact & Repair

تایبەتمەندیەکی دیکەی بەرنامەی ئەکسسە کەبەکاردێت بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی ئەو داتابەیسەکەی کەهەمانە .

سەرەتا بۆ ئەوەی دڵنیابین لەئیشەکە سەرەتا دەبێت بزانم ئەو فایلی داتابەیسەی کەهەمە قەبارەکەی چەندە ، سەرەتا کلیکی ڕاست لەسەر فایلەکە دەکەم و دەچمەسەر کۆتا دانە **Propertie**






**دەبینین قەبارەی فایلی داتابەیسەکە ١،٠٧ مێگابایتە دواتر داتابەیسەکەمان دەکەینەوە دەچینەسەر بەشی File گرتە لەسەرCompact & Repair Database دەکەین دەبینین دووبارە داتابەیسەکەمان دەکرێتەوە**



ئۆتۆماتیکی داتابەیسەکە ئەپدەیت دەبێتەوە دواتر داتابەیسەکەمان دادەخەین دووبارە کلیکی ڕاست لەسەر فایلی داتابەیسەکە دەکەین بۆ زانین قەبارەکەی




دواتر ئەم ویندۆیەدەکرێتەوە کەقەبارەی داتابەیسەکە پیشانداوە




دەبینین قەبارەکەی کەمبووەتەوە

# Protected Database

ئەگەر ئێمە فایلێکی داتابەیسمان هەبوو چۆن بتوانین ڕێگری لەوە بکەین کەسێکی دیکە بەکاری بێنێت و دەستکاری بکات ، ئێمە لەم بەشەدا تەنها سێ ڕێگە باس دەکەین :

١- دانانی پاشگری ACCDE

٢- دانانی پاسۆرلەسەر فایل

٣- لابردنی ڕووکاری بەرنامەکە

## پاشـگری ACCDE

سەرەتا داتابەیسەکەمان دەکەینەوە دواتر گرتە لەسەر File دەکەین دواتر گرتە لەسەر Save As دەکەین ویندۆیەك دەکرێتەوە و گرتە لەسەر Make ACCDE دەکەین



دواتر ئەم ویندۆیەك دەكرێتەوە و خەزنی دەكەین دواتر دەچین دەبینین فایلی داتابەیسەكە هێمای كلیلێكی لەسەرە.




دەچین دەیكەینەوە دووبارە دەبینین هێمای كلیلی لەسەرە




كەواتە ئیتر كەس ناتوانێ دەستكاری بكات

# دانانی پاسۆرد

سەرەتا بەشێوەیکی ئاسایی بەرنامەی ئەکسس دەکەمەوە لەخوارەوە گرتە لەسەر Open Other Files دەکەم ویندۆیەك دەکرێتەوە




دواتر ویندۆیەك دەكرێتەوە گرتە لەسەر Browser دەكەین



دواتر ئەم ویندۆیە دەكرێتەوە پێمان دەڵێت ئەو فایلی داتابەیسە هەڵبژێرە كەدەتەوێ پاسۆردی لەسەر دابنێیت من لێرەدا داتابەیسی (دەرمانخانە ) هەڵبژاردووە دەبینین لەتەنیشتی **Open** كۆبۆبۆكسێك هەیە گرتەی لەسەر دەكەین **OpenExclusiv** دەكەین دەبینین ڕاستەوخۆ داتایەیسەكەمان دەكرێتەوە .




## دواتر داتابەیسەكەمان دەكرێتەوە



دواتر گرتە لەسەر بەشی File دەکەین دواتر گرتە لەسەر Encrypt with password دواتر داوای وشەی نهێنی دەکات بۆی دابنێین .




**دەبینین داوای دانانی وشەی نهێنی دەکات**



دوای ئەوەی کە وشەی نهێنینی مان دانا ئیتر بمانەوێ داخلی ئەو داتابەیسە ببین دەبێت وشەی نهێتی داخل بکەین



# لادانی رووکاری بەرنامەکە

سەرەتا دەچینەسەر **File** دواتر لەخوارەوە دەچینەسەر **Option** دواتر **Current Database** هەڵدەبژێرین ئەم ویندۆیەی خوارەوە دەکرێتەوە :




١-**Display Form** فۆرمی سەرەکی هەڵدەبژێرین .

٢-**Display Status Bar** هێمای ڕاستەکەی لادەبەین .

٣- **Display Navigation Pan** هێما ڕاستەکە لادەبەین .

٤- **Allow Full Menu** هێما ڕاستەکە لادەبەین .

٥- **Allow Default Shortcut menus** هێما ڕاستەکە لادەبەین .

دواتر **Ok** دەکەین نامەیەکیش پیشان دەدات ئەویش **Ok** دەکەین .




**دواتر كاتێك داخلی داتابەیسەكە دەبینین ڕووكاری بەرنامەكە بۆ توانا كراوە .**

